# پوختەیەك لە
# کورتکردنەوە و کۆکردنەوەی
# نوێژ

نوسینی/ سعد عبداللە
پێداچونەوەی/ باوکی عمار

بسم الله الرحمن الرحيم

# پێشەکی

بسم الله والحمد لله والصلاة والسلام على رسول الله وعلى آله وصحبه ومن والاه

وبعد:

لەبەر پتەوبون وبەهێزی ڕیزی موسلمانان ونیەتی ئامۆژگاری کردنیان وزیاتر دور کەوتنەوەیان لەدەمەدەمێو قاڵ بون لەبابەتەکاندا بەگشتی ولەم باسەشدا بەتایبەتی ، وەهەروەها لەبەر یەکبونی تێگەیشتنمان وڕۆشتنمان لەسەر یەك ڕێبازو ، ئەم باسەم هەڵبژاردو بەپشتیوانی خوای گەورە دەستم دایە نوسینی ، بەڵکو خوای گەورە لەو کۆمەڵەمان بژمێرێت کەخۆشی ئەوێن وکوشتار دەکەن وپاشان ڕیزەکانیان پتەو و قایمە:﴿ إِنَّ اللَّهَ يُحِبُّ الَّذِينَ يُقَاتِلُونَ فِي سَبِيلِهِ صَفًّا كَأَنَّهُم بُنْيَانٌ مَّرْصُوصٌ ﴾ الصف 4

پێویستە ئاگاداریش بین دەست پێ کردنی گومڕایی لەدەمە دەمێ و( جدال )ەوە سەر هەڵدەدا، وەك پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت: ( ماأوتي قوم الجدل بعد هدي كانوا عليه إلا ضلوا ) رواه أحمد 25/5. واتە :هیچ قەومێك ( جدال ) یان تێ ناکەوێ ،دوای ڕێنموونیەك کەلەسەری بون (واتە ناکۆك نەبون ) بەتەئکید گومڕا دەبن ، بۆیە کاتێ هاوەڵەکانی پێغەمبەر ﷺدەنگیان لەسەر ئایەتێك لە ئایەتەکانی قورئان بەرزکردەوە پێغەمبەر ﷺ فەرموی : ( مهلا يا قوم بهذا أهلكت الامم قبلكم باختلافهم على انبيائهم و ضربهم الكتب بعضها ببعض فما عرفتم منه فاعملوا به و ما جهلتم منه فردوه الى عالمه ) رواه أحمد – مشكاة المصابيح، کەواتە ئیش کردن بەسوننەتی پێغەمبەر ﷺ چارەسەری گیرو گرفتەکانە ، ( ... ومن يعش منكم فسيرى إختلافا كثيرا فعليكم بسنتي وسنة خلفاء الراشدين ) رواه الترمذي ...واتە:

ئەوەی بزێ جیاوازییەکی زۆر دەبینێ ، جا ئەگەر ئەو جیاوازییەتان بینی ئەوا دەست بگرن بەسوننەتی من وسوننەتی چوار خەلیفەکەوە ... )، مەبەست لەم باسەش ئەوەیە هیچ حوکمێکی شەرعی نەکەینە بیانو بۆ کردنەوەی دەرگا بۆ جیاوازیەکان وشل بونی ریزەکانمان ، وەك پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت :(إقرؤا القرآن ما آتلفت عليه قلوبكم فإذا اختلفتم فقوموا عنه ) رواه البخاري عن جندب بن عبدالله ، واتە : قورئان بخوێنن تاکو سۆزو بەزەی لەنێوانتاندا هەیە ، جا ئەگەر لەسەر قورئان جیاوازیتان تێ کەوت ئەو کاتە مەیخوێنن ، هەروەها گوناح کردن هۆیەکی ترە بۆ تێك چونی نێوانی موسلمانان وەك پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێت :( ماتوادّ اثنان في الله عزوجل ثم افترقا الا بذنب يحدثه احدهما ) رواه البخاري في الادب رقم 401 ، وأحمد السلسلة الصحيحة 637. واتە : ئەگەر دو موسلمان یەکتریان خۆش ویست لەبەر خاتری خواو پاشان لەیەك جیا بونەوە، ئەوا جیا بونەوەکەیان بەهۆی ئەو تاوانەوەیە کە یەکێکیان ئەنجامیداوە، فەرمودەکەش پێشەوا ئەحمەد ریوایەتی کردوە، سەیری (سلسلة الاحاديث الصحيحة ) بکە .

هەروەها دەمار گیری بۆ کەسایەتی وبۆچونەکانی هۆیەکی ترە بۆ ناکۆکی، ئەمەش لەو نەزانیو جاهیلیەتەوە سەرچاوە دەگرێ کە ئیسلام دژیەتی، هەر وەکو پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت :( مابال دعوة الجاهلية دعوها فانهامنتنة ) پێشەوا بوخاری لە جابری کوری عبدالله وە ریوایەتی کردوە، ئەو دەمارگیرییەش کەلەم فەرمودەدا هاتوە لەسەر موهاجیرو (انصار)ییەکان بو کە چاکترین کۆمەڵی سەر زەوین، جا ئەگەر دەمار گیری بۆ دو کۆمەڵی وەك موهاجیرو (أنصار) بۆگەن بێت، ئەی ئەبێت حاڵی دەمارگیرییەکانی تر چۆن بێت، بۆیە من لەم باسەدا تەنها فەتوای زانایان و وتەکانیانم نوسیوە، ئەو کەسەش کەبەفەتوایەکی تر ئیش دەکات بەمەرجێ پێچەوانەی سوننەت نەبێت وپاشان نەبێتە هۆی ناکۆکی موسلمانان بابۆخۆی شوێن ئەو فەتوایە بکەوێت، ئەویش لەبەر رێگرتن وبەربەست

کردنی ماددەی جیاوازی، بۆیە پێشەوا (مالك) ڕەحمەتی خوای لێ بێت کاتێ (هارون الرشيد) داوای لێ کرد کە (موطأ)ەکەی بکەنە دەستوری هەمو خیلافەت، ڕازی نەبو وەفەرموی :(هاوەڵەکان ڕەزای خوایان لێ بێت پرش وبلاون ولەوانەیە خەڵکی شتێکیان لا بێت ونێمە پێمان نەگەشتبێ)..

هەروەها عبدالله ی کوڕی مسعود ﷺ کاتێك پێیان وت بۆ ئینکاریت کرد لە پێشەوا عثمان ﷺ و لەهەمان کاتدا چوار ڕکاتت کرد، فەرموی(اني لاكره الخلاف) لە ڕیوایەتێکی تردا دەفەرموێت (الخلاف كله شر) سەیری العمدة بکە.

لەکۆتاییدا هەر هەڵەو کەم وکوڕیەك هەبو ئەوا لەخۆمەوەیە ونەوەی پێچەوانەی قورئان وفەرمودەی پێغەمبەر ﷺ بێت، ئەوا من پەشیمانم لێی لەدونیاو قیامەتدا، خوای گەورە لێمان قبوڵ بکات و وەری بگرێت لێمان ... آمين.

﴿إِنْ أُرِيدُ إِلاَّ الإِصْلاَحَ مَا اسْتَطَعْتُ وَمَا تَوْفِيقِي إِلاَّ بِاللّهِ عَلَيْهِ تَوَكَّلْتُ وَإِلَيْهِ أُنِيبُ﴾

كتبه

سعد بن عبدالله بن احمد

الاربعاء 8/ذی الحجة/1422 الهجري

2002/2/20

# بەشی یەکەم

# کورت کردنەوە (القصر)

# یەکەم/ نوێژ کورت کردنەوە:

خوای گەورە دەفەرموێت:﴿ وَإِذَا ضَرَبْتُمْ فِي الأَرْضِ فَلَيْسَ عَلَيْكُمْ جُنَاحٌ أَن تَقْصُرُواْ مِنَ الصَّلاَةِ إِنْ خِفْتُمْ أَن يَفْتِنَكُمُ الَّذِينَ كَفَرُواْ إِنَّ الْكَافِرِينَ كَانُواْ لَكُمْ عَدُوًّا مُّبِينًا﴾ النساء 101.

پێشەوا (طبري) دەفەرموێت:﴿ وَإِذَا ضَرَبْتُمْ فِي الأَرْضِ﴾ واتە: ئەگەر ڕێگەتان بڕی ئیمانداران لەسەر زەویدا ﴿فَلَيْسَ عَلَيْكُمْ جُنَاحٌ﴾ ئەوا هیچ گوناه وتاوانێکتان لەسەر نی یە ﴿أَن تَقْصُرُواْ مِنَ الصَّلاَةِ﴾ واتە ژمارەی ڕکاتەکانی نوێژەکە کورت بکەنەوە، واتە ئەوەی لەکاتی تردا چوار دەکەن بیکەنە دوڕکات .. تفسیر الطبری 329/4.

ئایەتەکەش پەیوەست نی یە بەترسەوە، چونکە (یعلای کوڕی ئومیە) دەفەرموێت:( پرسیارم کرد لە عومەری کوڕی خەتتاب ( خۆ خەڵکی ترسی نەماوە بۆ نوێژ کورت بکەینەوە، پێشەوا عومەریش فەرموی:ئەوەی لای تۆ سەیربو لای منیش سەیر بو وپرسیارم کرد لە پێغەمبەر ﷺو ئەویش فەرموی:( صدقة تصدق الله عليكم فاقبلوا صدقته ) واتە: کورت کردنەوەی نوێژە چوار ڕکاتیەکان بەخششێکە لەلایەن خوای پەروەردگارەوە کەبە ئێوەی بەخشیوە ئێوەش ئەو بەخششە قبوڵ بکەن.

هەر لەم بارەیەشەوە دو ڕیوایەتی ترمان هەیە لەدو هاوەڵی بەڕێزی پێغەمبەرەوە ﷺ کەیەکێکیان (ابن عباس)ە وئەوی تریشیان (ابن عمر)ە فەرمودەکەی (ابن عباس) بەم شێوەیەیە:( جارێکیان پێغەمبەری خوا ﷺ لەمەدینەوە بەرەو مەککە کەوتە ڕێ، لەخوای پەروەردگار نەبێت لەکەس

ئەدەترساو دو ڕكات دو ڕكات نوێژی كرد ) قال الترمذي :هذا حديث صحيح وقال الحافظ في الفتح : وصححه النسائي .. تحفة الاحوذى 89/3.

وعن أبي حنظلة قال: سألت إبن عمر عن الصلاة في السفر فقال: ركعتان، فقلت: إن الله عزوجل قال:﴿ إن خفتم ﴾ ونحن آمنون، فقال: سنة النبي ﷺ . سەيرى تحفة الاحوذي بكە 89/3 .

واتە : ئەبى حنظلة دەفەرموێ: پرسيارم كرد لەعبدالله ى كوڕى عومەر دەربارەى نوێژ لەسەفەردا :فەرموى : دوڕكات ، وتم خوای گەورە دەفەرموێ ﴿ إن خفتم ﴾ واتە ئەگەر ترسان، ئێمەش لەناسايشداين، فەرموى : سوننەتى پێغەمبەرە ﷺ . سەيرى تحفة الاحوذى بكە 89/3.

واتە : ئەم حوكمە يەكسانە تيايدا لەسەفەردا، جاسەفەرەكە چ بەتەيارە بێت يان بەقيتار بێت يان سەفەر بێت بۆ كردن وئەنجام دانى كردەوەيەكى چاكە، يان سەفەرى گوناح بێت، وەهەر كەسێكيش ئيشەكەى وا پێويست بكات كەبەردەوام لەسەفەردا بێت، وەك كەشتيەوان وئەوەشى كە شوفێرە، مۆڵەتيان پێ دەدرێت كە نوێژ كورت بكەنەوەو ڕۆژوش بشكێنن، چونكە لەڕاستيدا موسافرن .

هەروەها پێشەوا (شنقيطي) دەفەرموێت:(أجمع العلماء على مشروعية قصر الرباعية في السفر خلافا لمن شذ، وقال: لاقصر الا في خوف ومن قال لا قصر الا في سفر طاعة خاصة فإنها اقوال لامعول عليها عن أهل العلم) أضواء البيان 282/1.

واتە : زانايان كۆڕاو يەكدەنگن لەسەر دروستى وڕێ پێدان بەكورت كردنەوەى نوێژى چوارى لەسەفەردا بە پێچەوانەى ئەوانەى كە شازن ودەڵێن: كورت كردنەوەى نوێژ نىيە تەنها لەترسدا نەبێت، وەدەڵێن: كورت كردنەوە نىيە تەنها لەسەفەرى خێردا نەبێت بەتايبەت، جائەم قسانە لاى زانايان هيچ بەڵگەيەك نيە كە پشتى پێ ببەسرێت .

كەواتە حوكمەكانى سەفەر تاقيامەت هەر بەردەوامن .(أربع مسائل في صلاة المسافر) ص 49_50.

# دووەم / پێناسەی سەفەر

ابن حزم رەحمەتی خوای لێبێت دەفەرموێت ( و السفر هو البروز عن محلة الإقامة، و كذلك الضرب في الارض، هذا الذي لا يقول احد من اهل اللغة(التي بها خوطبنا و بها نزل القرآن ) سواه فلا يجوز ان يخرج عن هذا الحكم إلا ما صح بإخراجه،ثم و جدنا رسول الله ﷺ قد خرج الى البقيع لدفن الموتى و خرج الى الفضاء للغائط و الناس معه، فلم يقصروا و لا فطروا، و لا افطر و لا قصر، فخرج هذا عن ان يسمى سفرا، و عن ان يكون له حكم السفر،فلم يجز لنا ان نوقع اسم سفر و حكم السفر إلا على من سماه من هو حجة في اللغة سفرا فلم نجد ذلك في اقل من ميل، فقد روينا عن ابن عمر انه قال : ( لو خرجت ميلا لقصرت الصلاة ) فأوقعنا اسم السفر، و حكم السفر في الفطر و القصر على الميل فصاعدا إذ لم نجد عربيا و لا شريعيا عالما اوقع على اقل منه اسم سفر وهذا برهان صحيح ) المحلى 19/5-20 اربع مسائل ص39.

واتە ابن حزم دەفەرموێ ( سەفەر دەرچونە لە شوێنی نیشتە جێبون بە هەمان شێوە رێگا بڕینیش لە جیهاددا واتە :( ضرب ) ئەمەیە پێناسەی سەفەر کە هیچ کەس نایلێت کە شارەزای زمانی عەرەبی بێت (واتە ئەو زمانەی کە گفتو گۆمان لە گەڵ کراوە هەر بەو زمانەش قورئان دابە زیوە ) تەنها بەو پێناسەیە نەبێت، کەواتە دروست نی‌یە هیچ سەفەرێك لەم حوکمە دەر بکەیت تەنها ئەوە نەبێت کە دەقێك دەری کردبێت ، ئینجا پێغەمبەر ﷺ دەرئەچو بۆ بەقیع بۆ دفن کردنی مردوەکان هەروەها دەرئەچو بۆ چۆڵەوانی بۆ سەر ئاو خەڵکی لەگەڵدابو، نوێژیان کورت نەکردەوە وەرۆژویان نەشکاند پێغەمبەریش ﷺ نوێژی کورت نەکردەوە وەرۆژوی نەشکاند کەواتە : ئەوە لەوە دەرچو کە ناوی سەفەر بێت وەلەو حوکمە دەرچو کە ئەوە حوکمی سەفەری هەبێت بۆیە دروست نی‌یە ناوی سەفەری لێبنێیت وە دروست نی‌یە حوکمی سەفەری بەسەر دابدەیت تەنها ئەوەنەبێت کە بەڵگە بێت

لەزمانەوانی عەرەبیدا ناوی نابێت سەفەر هیچ بەلگەشمان دەست نەکەوت لە میلێك کەمتر بێت، لە عبد الله کوری عومەرەوە رەزای خوایان لێبێت گێرامانەوە کە فەرمویەتی :(ئەگەر میلێك دەربچم نوێژ کورت ئەکەمەوە ) ئەوە ناوی سەفەرمان لێنا وە حوکمی سەفەر لە نوێژ و رۆژودا میلێك بەرەو ژورە چونکە زمان زانێکی عەرەبیمان نەبینیوە وەشەرع ناسێکی زانا لەوەکەمتری دانابێ لەسەفەردا ئەوەش بەلگەیەکی راستە (المحلی 19/5-20) (اربع مسائل 37)

کەواتە : پێناسەی سەفەر ئەگەر لە شەرعدا نەبو ئەیگێرینەوە بۆ نەریت واتە ( عورف ) شێخ الاسلام ئەفەر موێ : ( کل اسم لیس له حد في اللغة ولا في الشرع فالمرجع فیه الی العرف فما کان سفرا في عرف الناس فهو السفر الذی علق به الشارع الحکم ) واتە : هەموناوێك پێناسەی لەزمان و لە شەرعدا نەبو پێناسەکەی لە نەریت دایە واتە : ( عورف ) جا ئەوەی لە عورفی خەلکدا سەفەربو ئەوە ئەو سەفەرەیە کە خوای گەورە حوکمەکەی پێوە بەند ئەکات ) اربع مسائل 38

بەلام پێویستە بزانین عورف واتە : عورفی کاتی پێغەمبەر ﷺ نەك ئێستا ئەو عورفەی کاتی دابەزینی وەحی بوە بۆیە پێشەوا صنعانی ئەفەرموێ: (وینبغی ان یراد بالمعتاد ماکان في عصر النبوة ). سبل السلام

## سێیەم /بەلگەی زانایان لەسەر واجبێتی کورت کردنەوەو وەلام دانەوەیان :.

1- عن عائشه رضی الله عنها قالت:( فرض الله الصلاة حین فرضها رکعتین رکعتین في الحضر والسفر فاقرت صلاة السفر وزید في صلاة الحضر ) رواه البخاری ومسلم وأبوداود والنسائي وزاد أحمد الا المغرب فإنها وتر النهار والا الصبح فإنها تطول فیها القراءة .

واتە :نوێژ فەرز بو کاتێ کە خوای گەورە فەرزی کرد دو ڕکات دو ڕکات لەشوێنی نیشتە جێی ولەسەفەردا، پاشان نوێژی سەفەر وەك خۆی مایەوە و، دو ڕکات زیاد کرا لەنوێژی غەیری سەفەردا، لەڕیوایەتێکی پێشەوا ئەحمەددا ئەم زیادەیەشی لەگەڵدا هاتوە کەدەفەرموێت:( .. ..تەنها نوێژی مەغریب نەبێت لەبەر ئەوەی ویتری ڕۆژە وەتەنها بەیانیش نەبێت چونکە بەیانی قورئانی زۆری تێدا دخوێنرێ . پێشەوا زوهری دەفەرموێت:(وتم بەعوروە ئەی باشە (عائشە) کە ئەم فەرمودەیەی گێڕاوەتەوە بۆ کاتێك لەسەفەردایە نوێژە چوار ڕکاتیەکان وەك خۆی دەکات؟ عوروەش وەلامی دایەوەو فەرموی: چۆن پێشەوا (عثمان) (إتمام)ی کردو بۆ (إتمام) ەکەی (تأویل)ی هێنایەوە ئەویش هەر بەهەمان شێوەی پێشەوا (عثمان) (تأویل)ی کرد پێشەوا (إبن حجر)لە(فتح الباری)دا دەفەرموێت:لەعائیشەوە ڕیوایەت کراوە هۆی (إتمام)ەکەی ، هەر وەکو پێشەوا (بیهقی) لەڕێگەی هیشامی کوڕی عوروەوە ،ئەویش لەباوکیەوە :کە عائیشە کاتێك کە لەسەفەردا بوە نوێژەکەی چوار ڕکات چوار ڕکات دەکردو دو دو نەیدەکردن، عوروەش دەڵێت: منیش پێم وت بۆ نوێژەکەت دو ڕکات دوڕکات نەکرد ؟ ئەویش فەرموی: (واتە عائشە) ئەی کوڕی خوشکەکەم من لەسەرم ناڕەحەت نی‌یە کەنوێژەکەم چوار ڕکات چوار ڕکات بکەم . (إبن حجر)دەفەرمویت: (اسنادە صحیح) هەروەها دەفەرموێت: ئەم ڕیوایەتەش بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کەنوێژ کورت کردنەوە (رخصە)یەو (إتمام)یش بۆ کەسێك کەلەسەری ناڕەحەت نەبێت چاکترو باشترە لەکورت کردنەوە ..اهـ.

(شارح)ی (سنن أبی داود)یش دەفەرموێت : (واما حدیث فرضت الصلاة رکعتین فمعناه فرضت رکعتین لمن اراد الاقتصار علیهما ، فزید فی صلاة الحضر رکعتان علی سبیل التحتم واقرت صلاة السفر علی جواز الاقتصار ، وثبت دلائل جواز الاتمام فوجب المصیر الیها و الجمع بین دلائل الشرع) ذکره النوی (عون المعبود) 45/4 ، تحفة الاحوذی 84/3

2- عن ابن عباس ان الله عز وجل فرض الصلاة علی لسان نبیکم ﷺ علی المسافر

ركعتين وعلى المقيم اربعا والخوف ركعة ) رواه مسلم. واته : خوای گەورە نوێژی فەرز کردوە لەسەر زمانی پێغەمبەرەکەتان ﷺ لەسەر موسافر دو رکات وە بۆ نیشتە جێ چوار ڕکات ، وەلەحاڵەتی ترسدا یەك ڕکات .. بەچ شێوەیەك وەلامی بەلگەی یەکەم درایەوە بەهەمان شێوەش وەلامی ئەم بەلگەیەش دەدرێتەوە لەسەر واجب نەبونی کورت کردنەوەی نوێژ بەلکو سونەتی مۆکەدەیە نابێت تەرك بکرێت .

3- عن حفص بن عاصم بن عمر بن خطاب قال: واتە لە( حفص )ی کوڕی ( عاصم )ی کوڕی ئیمامی عومەرەوە فەرموی :لەگەڵ عبدالله ی کوڕی عومەردا بوم لەڕێگەی مەککە نوێژی نیوەڕۆی بۆ کردین ـ واتە بەجەماعەت ـ دوایی هاتین تاگەیشتینە کەل وپەلەکانمان، پاشان دانیشت وئێمەش دانیشتین ئینجا لای کردەوە بۆ ئەو شوێنەی کە نوێژی تیا کرد وخەڵکانێکی بینی بە پێوە بون، وتی: ئەوانە چی ئەکەن ؟ وتم :نوێژی سوننەت ئەکەن، وتی: ئەگەر سوننەتم بکردایە چوار ڕکات نوێژم دەکرد،کوڕی برام من هاوەڵی پێغەمبەرمﷺ کردوە ( لەسەفەردا دو ڕکات زیاتری نەدەکرد هەتا وەفاتی کرد، ،وەهاوەڵی ئەبو بکرم کردوە لەسەفەردا دو ڕکات زیاتری نەدەکرد هەتا وەفاتی کرد، وەهاوەڵی عومەرم کردوە لەسەفەردا، دو ڕکات زیاتری نەدەکرد هەتا وەفاتی کرد، وە هاوەڵی عثمانم کردوە لەسەفەردا دو ڕکات زیاتری نەدەکرد هەتا وەفاتی کرد،خوای گەورەش دەفەرموێت:بەڕاستی پێغەمبەر ( نمونەی پێشەوایەتیە بۆتان .. .. ) ارواء الغليل 3/3 ، بەلام لەڕیوایەتێکی پێشەوا ( مسلم ) دا (ابن عمر ) دەفەرموێت: پاشان ئیمامی عثمانم چوار ڕکاتی کرد، وەلەڕیوایەتەکەی ( بخاری ) یشدا دەفەرموێت: پاشان (إتمام )ی ئەکرد واتە نوێژە چوار ڕکاتیەکانی وەکو خۆی ئەکرد .

پێشەوا (ابن حجر )ی عەسقەلانی دەفەرموێت: ئەوەی کەڕیوایەت کراوە لەپێشەوا عثمانم ئەوەیە کەهۆی(إتمام )ی عثمان ئەوەبو کەوای دەبینی (قصر )تایبەتە بەوانەوە کەڕێ دەکەن لەسەفەرەکەیاندا، بەلام ئەوانەی لەسەفەردان وڕێ ناکەن ونیشتە جێن ئەوا حوکمی کەسێکی نیشتەجێیان

هەیەو(إتمام) دەکەن،بەڵگەش لەسەری ئەو ڕیوایەتەیە کە پێشەوا ئەحمەد ڕیوایەتی کردوەبە(سند)ێکی (حسن)لە(عباد)ی کوڕی عبداللە ی کوڕی زوبێرەوە، کەدەفەرموێت:کاتێ کەمعاویە هاتە لامان ودەیویست حەج بکات ،نوێژی نیوەڕۆی بۆ کردین بە دو ڕکات لەمەککەدا پاشان بەرەو (دار الندوة) کەوتە ڕێ ولەوێ (مەدان وعەمری کوڕی عثمان هاتنە لای و وتیان: ئەو کارەی کە عثمان ی کوڕی عەفان کردبوی سەبارەت بە(إتمام)ی نوێژەکە بۆ کاتێ لەمەککەدا بوایە تۆ واتا نەکردو کارەکەی ئەوت بایەخ پێ نەدا، (معاوية)ش فەرموی: عثمان کاتێ (إتمام)ی ئەکرد ئەگەر نەهاتایە بۆ مەککە، وەکاتێ کەلەمەککەدا بو نوێژی نیوەڕۆ عەسرو عیشای بەچوار ڕکات چوار ڕکات بۆ ئەکردین، پاشان ئەگەر دەربچوایە بۆ (منى) و(عرفة) نوێژی کورت ئەکردەوە وکاتێکیش کە لەحەج بگەرایەتەوە لە(منى) نوێژەکانی وەکو خۆی دەکرد واتە :بە(إتمام).

هەروەها (إبن بطال) دەفەرموێت: ئەوەی کە هۆی ڕاست ودروستە سەبارەت بە عائشەو عثمان ەوە کە نوێژەکانیان بە(إتمام) کردوە لەسەفەردا، ئەوەیە کە وایان دەبینیەوە، بۆیە پێغەمبەرﷺ (نوێژی کورت ئەکردەوە لەمەککەدا لەبەر ئەوە کورت کردنەوەکە لەسەر ئوممەتەکەی ئاسان بوە، بەڵام (عائشە و عثمان) (إتمام)ەکەیان هەڵبژاردبو ئەگەر چی لەسەریشیان قورستر بو سەبارەت بە (قصر)ەکەوە..

هەروەها پێشەو (طحاوى) وغەیری ئەویش لە پێشەوا (زوهرى)ەوە ڕیوایەتیان کردوە کەدەفەرموێت: کاتێ عثمان لە(منى) چوار ڕکاتی کرد لەباتی ئەوەی دو ڕکات بکات لەبەر ئەوە بو کەدەشتەکیەکان لەو ساڵەدا زۆر بوبون، ئەویش پێی خۆش بو کەفێریان بکات کە نوێژە چوار ڕەکاتیەکان هەر چوارە..

بەم شێوەیە بۆمان ڕون بویەوە لەو ڕیوایەتانەی سەرەوە کە بۆچونی ئەو زانایانە بەهێزترە کەدەڵێن: (قصر) لەسەفەردا بۆ نوێژە چوارییەکان (واجب) نی یە بەڵکو سوننەتی موئەکەدەیە، (قصر) خێرو پاداشتی زیاترە لە(إتمام) چونکە

پێغەمبەری خواﷺ ( هەر کاتێك کە لەسەفەردا بوایە ئەگەر چی بمایەتەوە هەر نوێژە چوار ڕکاتیەکانی دەکردە دو ڕکات، وەکو ئەو کاتەی لە(تبوك ) وەککەدا مایەوە، شتێکی ڕون وئاشکرایشە کە پێغەمبەرﷺ ( شتێك ناکات کە پاداشتەکەی کەمتر بێت بۆ زیاتر شارەزا بون سەیری ( تحفة الاحوذي ) بکە 3/ 86_87 .

## چوارەم / دەست پێ کردنی کورت کردنەوەی نوێژ :.

عومەری کوڕی عبیداللە ی کوڕی عومەر ئەمیری فارس بو، پرسیاری نوسی بۆ عبداللە ی کوڕی عومەر دەربارەی نوێژ، عبداللە ی کوڕی عومەر نوسی،کە پێغەمبەرﷺ ( ئەگەر لەماڵ دەرچوایە دو ڕکاتی دەکرد تا دەگەڕایەوە، هەروەها بەهەمان شێوە لە عبداللە ی کوڕی عباسەوە ڕیوایەت کراوە.

ئیمامی (شنقیطي ) ڕحمەتی خوای لێ بێت دەفەرموێت: موسافر دەست دەکات بە کورت کردنەوەی نوێژ ئەگەر لەماڵەکانی ئەو شوێنەی کە تێیدایەتی تێپەڕی کرد، بەو مەرجەی کەلەشارەکە هەموی دەرچێت، وەلەماڵەکەی خۆی (قصر) ناکات ئەگەر نیەتی سەفەریش بێنێت، وەلەناوەڕاستی شارەکەش نوێژ کورت ناکاتەوە، ئەمەش ڕای هەمو زانایانە، لەوانە هەر چوار پێشەواکە، وەزۆرینەی زانای شارو وڵاتەکان، وەلە پێغەمبەریشەوەﷺ فەرمودەکە وایە کەپێغەمبەرﷺ نوێژی لە(ذوالحلیفة ) کورت کردۆتەوە، پێشەوا (مالك)یش دەفەرموێت: ئەگەر لەشارەکەی بێستانی لێ بوکەخەڵکی تیا نیشتەجێ ئەبو، حوکمی شارەکەیە، جالەبەر ئەوە نوێژ کورت ناکاتەوە هەتا لەشارەکەی تێپەڕ نەبێت، زۆرینەی زانایان بەڵگەیان ئەوەیە کەنوێژ کورت ناکاتەوە هەتا لەشارەکەی تێپەڕ نەبێت، نوێژ کورت کردنەوە بەمەرج گیراوە بەسەفەرەوە،وەئەوەشی کەلەشار دەنەچێت سەفەری نەکردوە . سید سابق ئەفەرموێ ( ذهب جمهور العلماء الى ان قصر الصلاة يشرع لمفارقة الحضر والخروج من البلد وان ذلك شرط ولا يتم حتى يدخل اول

بیوتها ) فقه السنة 285/1 اربع مسائل 54 واتا : جەماوەری زانایان لەسەر ئەوەن کە کورت کردنەوەی نوێژ دەست پێنەکات بەبەجێ هێشتنی شوێنی نیشتە جێ بون وەدەرچون لە شوێنی خۆت وە ئەوەش مەرجە بۆ کورت کردنەوە نوێژ بە چوار رکاتی ئەکات لەگەرانەوەدا هەتا ئەیەتە ناو سەرەنای ماڵەکانەوە هەروەها ابن قدامە ئەفرموێ: ( ولو كانت قريتان متداينتين فاتصل بناء احداهما بالاخرى فهما كالواحدة، وان لم تتصل فلكل قرية حكم نفسها ) 261/2 اربع مسائل . واتە : ئەگەر دودێ نزیك بون خانوەکانیان بەیەك گەیشتبون ئەوە هەردوکیان وەك یەك دێ وان بەلام ئەگەر دور بون لە یەکترەوە ئەوە هەمو دێیەك حوکمی خۆی هەیە

هەروەها پێشەوا ( بخاری ) دەفەرموێت:(باب يقصر إذا خرج من موضعه ) واتە : باسی کورت کردنەوەی نوێژ ئەگەر لەشوێنەکەی خۆی تێپەری کرد. ئەنەس ﷺ دەفەرموێت: نوێژی نیوەڕۆم کرد لەگەڵ پێغەمبەرﷺ لەمەدینە چوار رکات ولە(ذي الحليفة ) دو رکات، (إبن حجر ) دەفەرموێت: واتە : ئەگەر نیەتی سەفەری هێنا .. فتح الباری 279/3 .

هەروەها (إبن المنذر) دەفەرموێت: ئەمزانیوە پێغەمبەرﷺ نوێژی کورت کردبێتەوە لەسەفەرێك لەسەفەرەکانی تەنها دوای دەرچون ئەبێت لەمەدینە، ئەمەش بۆچونی جەماوەرری زانایانە . الثمرات الجياد ص 158 .

## پێنجەم / ئایا لەگەڵ دەرچون پێویست دەکات نیەتی کورت کردنەوەی هەبێت یان کۆکردنەوە ؟

ئەوەی کەراستەو وەرگیراوە لای زانایان ئەوەیە، نیەت مەرج نیە بۆ کورت کردنەوەی نوێژو کۆکردنەوەو مەسحی خوف، هیچ کام لەمانە پێویستیان

بەدامەزراندی نیەت نی‌یە . سەیری ( المغنی والشرح الکبیر ) 258/2 و( فقه السنة ) 245/1 و( مجموعة الفتاوی ) 13/24 بکە .

قال سید سابق ( رحمه الله ) : ولا تشترط النیة من الجمع والقصر قال إبن تیمیة وهو قول الجمهور جمیعا . 245/1 .

قال شیخ الاسلام: وهکذا اختلفوا في الجمع والقصر هل یشترط له النیة ؟ فالجمهور لایشترطون النیة کمالك وأبو حنیفة وهو أحد القولین في مذهب أحمد وهو مقتضی نصوصه .

والثاني تشترط کقول الشافعي وکثیر من أصحاب أحمد کالخرقي وغیره والاول أظهر ومن عمل باحد القولین لم ینکر علیه . مجموعة الفتاوی 13/24 .

تێبینی : پێویست ناکات پێش نوێژ بەخەڵکی بڵێت من نوێژ کورت ئەکەمەوەوئەگەر خەڵکی نی‌یەتی دو رکاتی هێنا پێش نوێژ چواری کرد نوێژەکەی تەواوە چونکە کاتێ عثمانی کوری عفان لە حەج چواری کرد خەڵکی هەموی بەتەمای دو رکات بون کەسیش نوێژی دوبارە نەکردەوە .هەروەها شیخ الاسلام دەفەرموێ : وکذلك لما جمع بهم لم یعلمهم انه جمع قبل الدخول بل لم یکونوا یعلمون انه یجمع حتی یقضی الصلاة الاولی فعلم ایضا ان الجمع لا یفتقر الی ان ینوی الی الشروع في الاولی کقول الجمهور والمنصوص عن احمد یوافق ذلك الفتاوی الکبری 146/1 اربع مسائل 68 . واتە : هەر بەو شێوەیە کاتێك پێغەمبەر ﷺ نوێژی کۆ کردەوە لەگەڵ هاوەڵەکاندا ئاگاداریان نەکردنەوە کەنوێژ کۆ دەکاتەوە پێش کاتی نوێژەکە بەڵکو نەیان زانی نوێژ کۆ دەکرێتەوە هەتا نوێژی یەکەم تەواو بو کەواتە رون بۆوە کۆکردنەوەی نوێژ پێویستی بە نیەت نی‌یە لەکاتی نوێژی یەکەمدا وکو وتەی جەماوەری زانایان وەدەقی پێشەوا ئەحمەد . بەڵام ئەگەر پێش نوێژێك خەڵکەکەی ئاگادار کردەوە هیچی لەسەر نی‌یە . تەنها لەو کاتەدانەبێ کە خەڵکەکەنیشتەجێبن و ئیمام موسافر بێت

## شەشەم /ئایا جیاوازی سەفەری دورو سەفەری نزیك هەیە؟

هیچ جیاوازیەك لەسەفەری دور وسەفەری نزیك نی‌یە وەك (شیخ الاسلام إبن تیمیە) دەفەرموێت: جیاوازی لەنێوان سەفەری کورت وسەفەری درێژ، ئەم جیاوازی‌یە هیچ بنەمایەکی نی‌یە نەلەقورئانداوە نەلەسوننەتی پێغەمبەردا ﷺ، بەڵکو حوکمەکان کەخوای گەورە کەباسیان لێوە دەکات بەشێوەیەکی (مطلق) واتە:بێ سنور، باسیان دەکات، وەك خوای گەورە لەئایەتی پاك کردنەوەدا دەفەرموێت: (ئەگەر ئێوە نەخۆش کەوتن یان لەسەفەر بون) (مائدة) /60 لەئایەتی ڕۆژویشدا دەفەرموێت: (هەرکەسێك نەخۆش بو یان لەسەفەر بو، ڕۆژانی تر بیگێڕێتەوە) (البقرة)/184 ، وەدەفەرموێت: (ئەگەر سەفەرتان کرد لەسەر زەویدا تاوانتان لەسەر نی‌یە ئەگەر نوێژ کورت بکەنەوە، ئەگەر ترستان لەکافران هەبو، هەروەها پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت: (خوای گەورە ڕۆژوی ڕمەزان ونیوەی نوێژی فەرزی لەسەر لابردون) تادەگاتە ئەوەی کە(شیخ الاسلام) دەفەرموێت: (بەم دەقانەو غەیری ئەم دەقانەش لەقورئان وسوننەتی پێغەمبەر ﷺ هیچ جیاوازییەك نی‌یە لەنێوان سەفەری نزیك وسەفەری دوردا، جا هەر کەسێك جیاوازی خستە نێوان سەفەری نزیك وسەفەری دور، ئەوا جیاوازی دەخاتە نێوان دو شتەوە کە خوای گەورە بەیەکەوە باسیانی کردوە، بەجیاوازییەك کە هیچ بنەمایەکی نی‌یە نەلەقورئان و نەلەسوننەتی پێغەمبەردا ﷺ ، مجموعة الفتاوى 24 /24 -25.

## حەوتەم / ئایا ماوەیەکی دیاری کراو لەشەرعدا دیاری کراوە بۆ کورت کردنەوەی نوێژ ؟.

بێ گومان جیاوازی هەیە لەنێوان پێشەواکاندا لەدیاری کردنی ئەو ماوەیەی کە

پێی دەوترێ سەفەر، بەلام هیچ کام لەو فەرمودانە دیاری کردنی تێدا نییە، لەوانەشە یەکێك بڵێت: خوای گەورە دەفەرموێت:﴿ **ما فرطنا في الكتاب من شيء** ﴾ واتە: هیچ شتێك نییە کە خوای گەورە لەقورئاندا رونی نەکردبێتەوە، یان دەفەرموێت:﴿ **وَكُلَّ شَيْءٍ فَصَّلْنَاهُ تَفْصِيلاً** ﴾ لەوەلامدا ئەڵێین: راستە دینەکەمان وەك خوای گەورە دەفەرموێت:﴿ **الْيَوْمَ أَكْمَلْتُ لَكُمْ دِينَكُمْ وَأَتْمَمْتُ عَلَيْكُمْ نِعْمَتِي وَرَضِيتُ لَكُمُ الإِسْلاَمَ دِينًا** ﴾ جولەکەیەك بەعومەری کوڕی خەتتابی وت: ئایەتێك لەقورئاندا یە ئەگەر بۆ ئێمە دابەزیایە ئەمانکرد بەجەژن، ئینجا ئەو ئایەتەی خوێندەوە، هەروەها پێغەمبەرﷺ دەفەرموێت: (هیچ شتێك نییە نزیکتان بکاتەوە لەبەهەشت ودورتان بخاتەوە لە جەهەنم ئیلا فەرمانم پێ کردون، وەهیچ شتێك نییە دورتان بخاتەوە لەبەهەشت ونزیکتان بکاتەوە لەجەهەنم ئیلا قەدەغەم لێ کردون، ئەمە پێشەوا شافعی ریوایەتی کردوە سەیری (مشكاة المصابيح) بکە . بۆیە گەڕانەوە بۆ سوننەتی پێغەمبەرﷺ باشترە لە(قیل وقال) و ئەو جیاوازیانەش ئەگەر چی لەدیندا شتی وانییە، وەك خوای گەورە دەفەرموێت:﴿ **وَلَوْ كَانَ مِنْ عِندِ غَيْرِ اللّهِ لَوَجَدُواْ فِيهِ اخْتِلاَفًا كَثِيرًا** ﴾ واتە: ئەگەر ئەو قورئانە لەغەیری خواوە بوایە جیاوازی زۆری تیادا دەبو،هەرچەندە ئەو جیاوازیانە یاداشتیان بۆ نوسراوە، بەلام زۆری ئەو جیاوازیانە لەشەرعدا نین، لەبەر ئەوە ئەوەی دروستە شوێن هەر کام لەوانە بکەوێت بەتایبەتی لەعامەی خەڵك بو، بەڵگەی بەهێزی نەدەزانی، بەلام بۆکەسێك جێگەی لۆمەیە کەخۆی بەشوێن کەوتەی بەڵگە بزانێت، بۆیە (ابن تيمية) دەفەرموێت: دیاری کردن بەمیل وبەفەرسەخ پێویست دەکات بەناسینی ماوەی ڕوبەری زەویەکان، ئەمەش کەس نازانێ تەنها کۆمەڵێکی تایبەتی کەم نەبێت، ئەوەی ئەوانەشی باس کردوە بەچاو لێکەری لەغەیری خۆیەوە (نقل)ی دەکات، ئەوەش شتێکی وانییە لەشەرعدا بڕیاری یەکجاری لەسەر درابێت،

پێغەمبەریش ﷺ ماوەیەکی دیاری نەکردوە لەوتارەکانیدا، لەکاتێکدا پێغەمبەر ﷺ نێرراوە بۆ هەمو خەڵکی ) مجموعة الفتاوی 27/24 .

هەروەها پێشەوا ( بیهقی ) دەفەرموێت: ( وهذا كله صحيح وليس في كله تحديد لاقل مايقع عليه اسم االسفر ) واتە: فەرمودەکان هەمویان ڕاستن ( ئەوانەی کە باسی ماوەیان تێدا هاتوە لە 3 ڕۆژەوە هەتا تاقێك ) بەڵام لەهەمویاندا دیاری کردنی تیا نی‌یە بۆ کەمترین ماوەیەك کەناوی سەفەری لێ بنرێت ) سەیری ( الثمرات الجیاد ) بکە ص 153 .

هەروەها ( إبن تیمیة ) دەفەرموێت: ( .. پێغەمبەر ﷺ ماوەی کورت کردنەوەی نوێژی دیاری نەکردوە بەسنورێك، نەکات ونەشوێنی، ئەوانەش وتراون لەو بارەوە جیاجیان وهیچ کامیان بەڵگەیان تیانی‌یە وناتوانیت سنورێکی دیاری کراوی بۆ دابنێیت، هەرەوەها دەفەرمویت: ( ئەمەش ڕای زۆرینەی پێشینان وشوێن کەوتوانە، ئەمەش ڕاسترینی وتەکانەلەڕوی بەڵگەوە ) مجموعة الفتاوی 12/24 .

هەروەها ( صدیق خان ) دەفەرموێت: ( پێویستە بگەڕێینەوە بۆ ئەوەی کە بەچی دەوترێت سەفەر لەشەرعدا یان لەزمانەوانیدا یان لەنەریتی خەڵکدا، جا ئەوەی کە دەرچون بو ئەوا ئەوە سەفەرەو واجبە دو ڕکات بکەیت ) الروضة الندية 152/1 .

هەروەها ( إبن تیمیة ) دەفەرموێت: ( دیاری کردنی ماوەیەکی دیاری کراو بۆ سەفەر هیچ بنەمایەکی نی‌یە، نەلەشەرع نەلەزامان نەلە نەریت نەلە عەقڵ، زۆرینەی خەڵکیش پێوانە نازانێت .. بۆ زیاتر شارەزا بونیش لەوتەی زانایان لەدیاری کردنی ئەو ماوەیەی کەدایان ناوە بۆ ئەوەی‌کەسێك پێی بوترێت ( مسافر ) ونوێژەکەی تیا کورت بکاتەوە، سەیری عون المعبود ج4/ 47-49 شەرحی فەرمودەی 1198، والمنتقی شەرحی ( الموطا ) ج2/251-254 بکە لەگەڵ اربع مسائل .

## هەشتەم / ئایا چەند ڕۆژ بۆت هەیە نوێژ کورت بکەیتەوە ؟

إبن عباس لە پێغەمبەری خواوە ﷺ ڕیوایەتی کردوە کە پێغەمبەر ﷺ لەهەندێ لەسەفەرەکانیدا (18) ڕۆژ ماوەتەوە، دو ڕکات دو ڕکات نوێژە چوار ڕکاتیەکانی دەکرد، (إبن عباس) خۆیشی دەفەرموێت: (ئێمە لەسەفەرەکانماندا ئەگەر (19) ڕۆژ بماینایەتەوە، ئەوا ئێمەش بەهەمان شێوە نوێژەکانمان دو ڕکات دو ڕکات دەکرد، وەئەگەر زیاتر لە(19) ڕۆژ بماینایەتەوە (إتمام)مان دەکرد، واتە: نوێژەکانمان وەکو خۆی دەکرد هەر بەچوار ڕکاتی . رواه البخاري تحفة الاحوذي 91/3 . هەروەها عیمرانی کوڕی حوصەین دەفەرموێت: (لەگەڵ پێغەمبەری خوادا ﷺ بەشداری جەنگم کردوە بەشداری (فتح)ی مەککەم کرد جا پێغەمبەر ﷺ لەمەککە (18) شەو مایەوە ولەدو ڕکات زیاتری نەدەکردو دەیفەرمو: ئەی دانیشتوانی مەککە ئێوە نوێژەکانتان وەکو خۆی بکەن، واتە: چوار ڕکات، چونکە ئێمە لەسەفەرداین. رواه ابو داود .عون المعبود 68/4

(إبن عباس) لە پێغەمبەرەوە ﷺ ڕیوایەتی کردوە کە پێغەمبەر ﷺ لەمەککە (17) ڕۆژ ماوەتەوەو نوێژەکانی کورت کردۆتەوە، (إبن عباس) دەفەرموێت: جاهەر کەسێك لەسەفەرەکەیدا (17) ڕۆژ بمێنێتەوە ئەوا نوێژەکانی کورت دەکاتەوە، وەئەگەر زیاتر مایەوە لە(17) ڕۆژ (إتمام) دەکات . رواه ابو داود .عون المعبود 69/4 .

(إبن عباس) دەفەرموێت: پێغەمبەر ﷺ لەمەککە ڕۆژی (فتح) (15) ڕۆژ مایەوەو نوێژەکانی کورت دەکردەوە .. 70/4 .

(أنس)ی کوڕی مالك دەفەرموێت: لەگەڵ پێغەمبەری خوادا ﷺ لەمەدینەوە بەرەو مەککە کەوتینەڕێ جا پێغەمبەر ﷺ لەمەککەدا هەتا لەوێ بو نوێژەکانی کورت دەکردوە هەتا گەڕایەوە بۆ مەدینە، پرسیار کرا لە(أنس) ئایا چەند ڕۆژ

لەمەککەدامانەوە؟ ئەویش فەرموی: ( 10 ) ڕۆژ ماینەوە لەمەککەدا .عون المعبود 71/4.

لە پێشەوا ( علی )ەوە ڕیوایەت کراوە کە فەرمویەتی : هەرکەسێك لەسەفەردا ( 10 ) ڕۆژ مایەوە ئەوا نوێژەکانی وەکو خۆی دەیانکات وکورتیان ناکاتەوە ،بەلام لەڕیوایەتەکەی ( عبدالرزاق )دا بەم شیوەیەیە : ئەگەر لەسەفەرەکەتدا ( 10 ) ڕۆژ مایتەوە ئەوا نوێژەکان وەکو خۆی بکە،جا ئەگەر حاڵەت وابو ئەتوت ئەمڕۆ نا بەیانی دەگەڕێمەوە،ئەوا نوێژەکانت کورت بکەرەوە، ئەگەر چیمانگێکیش لەو شوێنەدا بمێنیتەوە بەو حاڵەوە .. تحفة الاحوذی 91/3.

لە( إبن عمر )ەوە ڕیوایەت کراوە کەفەرمویەتی: هەرکەسێك لەسەفەرەکەیدا ( 15 ) ڕۆژ مایەوە،نوێژەکانی کورت ناکاتەوە وبە( إتمام ) دەیانکات، أخرجه محمد بن الحسن في كتاب الاثار، تحفة الاحوذي 91/3.

هەروەها ڕیوایەتێکی تر لە( إبن عمر )ەوە هەیە کە دەفەرموێت: ئەگەر ( مسافر ) بویت وبڕیارتدا لەسەفەرەکەتدا ( 15 ) ڕۆژ بمێنیتەوە، ئەوا نوێژەکانت بە( إتمام ) بکە، بەلام ئەگەر بڕیارت نەدا بەوشێوەیەو نەت ئەزانی کەچەندێك دەمێنیتەوە، ئەوا نوێژەکانت کورت بکەرەوە . تحفة الاحوذی91/3.

( سعید )ی کوڕی ( المسیب ) دەفەرموێت: ئەگەر سەفەرت بۆ شوێنێك کردو ( 15 ) ڕۆژ تیایدا مایتەوە،ئەوا نوێژەکانت بە( إتمام ) بکە :واتە وەکو خۆی بیانکە. تحفة الاحوذي 92/3.

لەدوای ئەمانەوە زانایانی ئیسلام جیاوازیان لەنێواندا هەیە لەسەر ئەو کاتەی کە ( مسافر ) بۆی هەیە کەلەسەفەرەکەیدا نوێژەکانی تیا کورت بکاتەوە، سوفیانی ( ثوري )و( أهل )ی کوفە ( 15 ) ڕۆژیان دیاری کردوە بۆ ( مسافر ) کە لەسەفەرەکەیدا بۆی هەیە نوێژەکانی تیا کورت بکاتەوە، هەروەها ئەشلێن: ئەگەر ( مسافر ) بڕیاری دا کە ( 15 ) ڕۆژ لەشوێنی سەفەرەکەیدا بمێنێتەوە ئەوا ( إتمام ) دەکات، پێشەوا ئەوزاعیش دەفەرموێت: ئەگەر ( مسافر ) بڕیاری دا کە ( 12 ) ڕۆژ

بمێنێتەوە ئەوا (اتمام) دەکات، پێشەوا مالك وشافعی وئەحمەدیش دەفەرمون: ئەگەر (مسافر). بڕیاری دا کە(4) ڕۆژ یان زیاتر لەشوێنی سەفەرەکەیدا بمێنێەوە ئەوا (اتمام) دەکات، پێشەوا (اسحاق)ی کوڕی (راهویە) پێی وایە کە بەهێزترینی بۆچون ورایەکان ئەوەیانە کە فەرمودەکەی (ابن عباس)ی لەسەرمو لەپێغەمبەرەوەﷺ ڕیوایەتی کردوەو دەفەرموێت: پێغەمبەر ﷺ لەهەندێ لەسەفەرکانیدا (19) ڕۆژ مایەوەو نوێژەکانی دو ڕکات دو ڕکات دەکرد، (ابن عباس) خۆیشی دەفەرموێت: ئەگەر ئێمە (19) ڕۆژ بماینایەتەوە دو ڕکات دو ڕکات نوێژەکانمان دەکردو ئەگەر زیاتریش لەوە بماینایەتەوە نوێژەکانمان وەکو خۆی دەکرد.. تحفة الاحوذی 3/92-94.

پێشەوا (بیهقی) دەربارەی ئەو جیاوازیانەی کە لەڕیوایەتەکاندا هاتوە سەبارەت بەمانەوەی پێغەمبەر ﷺ لەمەککەدا دەفەرموێت: ئەوەی کە فەرمویەتی پێغەمبەر ﷺ (19) ڕۆژ ماوەتەوە ڕۆژی چونە ناو ڕۆژی دەرچونیشی پێوە ژمێردراوە، ئەوەیشی کەدەڵێ (17) ڕۆژ، ڕۆژی چونە ناو دەرچونی لێ لابردوە، وەئەوەیشی کە دەڵێ (18) ڕۆژ، دانەیەکیانی لێ لابردوە . اهـ .

بەلام سەبارەت بەڕیوایەتی (15) ڕۆژەوکەوە پێشەوا (ابن حجر) دەفەرموێت: لە کتێبی (خلاصە)دا بەلاوازی داینا‌وە، وەئەگەر (ثابت)یش بێت واتە: (صحیح) بێت ئەوا بەشێوەیەك لێك دەدرێتەوە، گێڕەرەوەی فەرمودەکە وای گومان بردوە کە پێغەمبەر ﷺ ڕیوایەتی (17) ڕۆژەکەیە، ئەمیش ڕۆژی چونە ناو دەرچونی لێ لابردوەو بە(15) ڕیوایەتی کردوە، ئەمەش ئەوە دەگەیەنێ کەڕیوایەتی (19) ڕۆژەکە لەهەمویان (راجح) ترەو پێشەوا (اسحاق)یش ئیشی بەمەییان کردوە .. هەتا دەگاتە ئەوەی پێشەوا (ابن حجر) دەفەرموێت: کۆکردنەوەو (جمع)ەکەی پێشەوا (بیهقی) کۆکردنەوەیەکی بەهێزو دامەزراوە، دەمێنێتەوە ڕیوایەتی (15) ڕۆژەکە، سەبارەت بەمەش بە(شاذ) دەژمێردرێت، چونکە پێچەوانەی ڕیوایەتە بەهێزەکانە، هەروەها ڕیوایەتی (20) ڕۆژەکەش هەر بە(شاذ) دەژمێردرێت

بەهەمان شێوەی ڕیوایەتی (15) ڕۆژەکە، ڕیوایەتی (18) ڕۆژەکەیش (صحیح)نی‌یە لەڕوی (اسناد)وە ..اهـ . قسەکانی (ابن حجر) کۆتایی پێ هات.

بەم شێوەیە بۆمان ڕون دەبێتەوە کە ڕیوایەتی (19) ڕۆژەکە لەهەمویان بەهێزترە جا بۆیە هەر کەسێك بڕیاری دا لەسەفەرەکەیدا (19) ڕۆژ یان زیاتر بمێنێەوە، ئەوا با نوێژەکانی وەکو خۆی بکات،واتە: کورتیان نەکاتەوە، بەلام ئەگەر کەسێك لەسەفەردا بو نەیدەزانی چەند لەسەفەرەکەیدا دەمێنێتەوە ئەوا بۆی هەیە نوێژەکانی کورت بکاتەوە ئەگەر چی چەند سالێکیش بمێنێتەو، هەروەکو (ابن المنذر) دەفەرموێت: (أجمع أهل العلم ان للمسافر أن یقصر مالم یجمع اقامة وان أتی علیه سنون ..) فقه السنة 288/1 و تحفة الاحوذی 93/3 .

ئەو ڕیوایەتانەشی کەلەهەندێ لە هاوەلانی پێغەمبەرەوە ﷺ گێڕڕاونەتەوە هەر بەم شێوەیە بون،واتە :ئەیان زانیوە لەسەفەرەکەیاندا چەندێك دەمێننەوە، لەو ڕیوایەتانەش:

أ- عبدالله ی کوڕی عمر(6)مانگ لە(اذربیجان) مایەوەو نوێژی کورت دەکردەوە لەبەر زۆری بەفر. بڕوانە (إرواو الغلیل) 28/3 ، (بیهقی) ڕیوایەتی کردوە .

ب- أنسی کوڕی مالك (2) سالْ لەشام مایەوە نوێژی کورت دەکردەوە.

ج- عبدالرحمانی کوڕی سەمورە (2) سالْ لە کابول مایەوە نوێژی کورت دەکردەوە، بەلام لەم حالەتەدا تەنها نوێژەکەی کورت دەکاتەوە، مەگەر عوزرێکی شەرعی هەبێت بۆ کۆکردنەوەی کەلەدوایدا دێینە سەری .. سەیری (زاد المعاد) بکە 463/1 .

پێشەوا احمد دەفەرموێ: اذا نوی الاقامة اربعة ایام اتم ، وان نوی دونها قصر وحمل هذه الاثار واصحابه لم یجمعوا الاقامة البته بل کانوا یقولون الیوم نخرج غدا نخرج واتە ئەگەر نیەتی مانەوەی چوار ڕۆژی هێنا نوێژەکە بە تەواوی ئەکات واتە چوار ڕکات ، بەلام ئەگەر لەوەکەمتر نیەتی هێنا واتە لە چوار ڕۆژ کەمتر نوێژ

کورت دەکاتەوە وە ئەو فەرمودانە ئەوەی لێوەردەگیرێ کە پێغەمبەر ﷺ وە هاوەڵەکانی نیەتیان نەبوە نیشتە جێ بن بەڵکو وتویانە ئەمڕۆ دەرەچین بەیانی دەرئەچین . اربع مسائل .

* ئەوەی کە ماوە تیشکی بخەینە سەر ئەوەیە، ئەگەر کەسێك گومانی هەبو لەوەی (مسافر)ە یان نا یان یەکێ پێی ئەڵێت دو ڕکات بکەو یەکێك پێی ئەڵێت چوار ڕکات بکە، ئەگەر توشی گومان بو ئەوا باشتر وایە نوێژەکە بەتەواوی بکات، هەروەك (ابن تیمیه) دەفەرموێت :(فمن كان عنده شك في جواز القصر فأراد الاحتیاط فلاتمام أفضل) واتە: ئەوەی گومانی هەبو لەدروست بونی کورت کردنەوەو ویستی (إحتیاط) بکات، چوار ڕکات، (إتمام) بۆی باشترە.

هەروەها دەربارەی ئەو کەسەش کە زیاتر لەچوار ڕۆژ لەسەفەرەکەیدا بمێنێتەوە دەفەرموێت: باشتر وایە نوێژەکانی بە(إتمام) بکات. مجموعة الفتاوى 24/13-1 .

تێبینی: ئەگەر کەسێك هیجرەتی کرد بۆ شوێنێك پێویستە دوای چوار ڕۆژ چوار ڕکات بکات وبۆی نیە بەردەوام نوێژ کورت بکاتەوە، چونکە قیاس ناکرێتە سەر ئەوەی کە بەردەوام نیەتی گەڕانەوەی هەبێت، چونکە جیاوازی هەیە لەنێوان (مسافر)ێك کە بەشێوەیەکی کاتی دەڕوات بۆ شوێنێك لەگەڵ موهاجیرێك کەنیشتە جێیە و بەتەمایە شەهید ببێت ،بەلأم بۆی هەیە لەسەرەتای هاتنیدا چوار ڕۆژ نوێژکورت بکاتەوە هاوەڵەکانی پێغەمبەریش ﷺ ئەوانەی لەمەککەوە هاتن کە بەس تەنها (اهلی صوففه کە ژمارەیان 400 بو ماڵ و حاڵیشیان نەبو نوێژیشیان چوار ڕکاتی دەکرد نابێت کەسێك بەبیانوی نیەتی گەڕانەوە بۆ شوێنی نیشتەجێیی دورکات دو ڕکات بکات چونکە گەڕانەوە بۆ شوێنێك کە هیجرەتت لێکردوە پێش فتح کردنی لە تاوانە گەورەکانە پێغەمبەر ﷺ ئەفەرموێت : (والمرتد بعد هجرته اعرابیا ) رواه النسائی و ابو داود صحیح الجامع الصغیر/ فتح الباری باب التعرب في الفتنة. بەڵگەی ئەوەش کە لە شوێنی هیجرەتدا نوێژ کورت ناکرێتەوە

( عثمانی الطویل ) له تابعیەكەوە كە ناوی ( روفیعی كوری‌مهرانی بصریة ) كە ناسراوە بە ( ابو العالیةالریاحی ) ئەفەرموێ : خطبنا ابو بكر فقال قال رسول الله ﷺ للمقیم اربع وللظاعن ركعتان مولدی بمكة ومهاجری بالمدینة فإذا خرجت من المدینة فصاعدا من ذی الحلیفة صلیت ركعتین حتی اجع الیها فقلت لرفیع انی اتی البلد فاقیم به شهرین افاقصر الصلاة؟ قال نعم وان اقمت به خمسین سنة حتی ترجع الی قارك )ابو نعیم في الحلیة 222/5 البخاری في التاریخ الكبیر 258/3/2 اربع مسائل 62 واتە عثمان الطویل لە ابو العالیەوە ئەگێرێتەوە وتی ابو بكر وتاری بۆ داین فەرموی پێغەمبەر ﷺ فەرموی بۆ نیشتەجێ چوار و بۆ موسافر دو ركات شوێنی لە دایك بونم مەككەیە وشوێنی هیجرەتم مەدینەیە جا ئەگەر لە مەدینە دەرچم ئەولای مەدینەش لە ذو الحلیفةوە دو ركات دەكەم هەتا ئەگەڕێمەوە بۆ مەدینە وتم بە روفیع من دێم بۆ ئەم ولاتە دو مانگ ئەمێنمەوە ئایا نوێژ كورت بكەمەوە وتی بەڵێ ئەگەر پە نجا ساڵ لە وێ بویت هەتا ئەگەڕێیتەوە شوێنی نیشتەجێبونت. پێغەمبەریش ﷺ خۆی لەمەدینە دو ڕكاتیان نەكرد، بەڵكو هەمویان چوار ڕكاتیان دەكرد كەئەم مەسەلەیە وەك ( إجماع )و كۆڕای هاوەڵەكان وایە واتە اجماعی سكوتی .بەلاًم خاڵە سەربازیەكان كە دورن لە شوێنی نیشتەجێ و هیجرەتەوە هەندێكیان ماوەی سەفەر دەیگرنەوە ، سەیری خاڵی حەوتەم بكە لە كورت كردنەوەی نوێژ هەروەها خاڵی بیستەم لە كورت كردنەوەی نوێژ

## نۆیەم / لەگەڕانەوەدا تاكوێ نوێژ كورت دەكەیتەوە؟

وەك چۆن لەدەست پێ كردنی نوێژ كورت كردنەوەدا باسمان كرد كەلەدەرچونی لەئاوەدانی وبەجێ هێشتنی خانوەكانی شوێنی نیشتە جێ كەی ئەو حوكمە دەست پێ دەكات لەكاتی گەڕانەوەشدا چونە ناو شار كۆتایی هاتنە بەو حوكمە، جا ئەگەر نزیك بویتەوە لەئاوەدانی ومالەكانت لێ دیار بو ئەوا بەردەوام نوێژ كورت دەكەیتەوە هەتا چونە ژورەوەی شارەكە، پێشەوا بوخاری ڕیوایەت دەكات

ودەفەرموێت: علی کوڕی ئەبو طالب ﷺ لەکوفە دەرچو بۆ سەفەر ماڵەکانی لێ دیاربو نوێژی کورت دەکردەوە، کاتێ گەڕایەوە وتیان: ئەمە کوفەیە! فەرموی: نەخێر هەتا دەچینە ناوی، لەڕیوایەتەکەی تردا دەفەرموێت: (علی بن ربیعه) وتی: دەرچوین لەگەڵ علی کوڕی ئەبو طالبدا نوێژمان کورت دەکردەوەو ماڵەکانیشمان لێ یدار بون و دەمانبینی، وەلە(وقاء بن إیاس)ەوە دەفەرموێت: (دەرچوین لەگەڵ علی کوڕی ئەبو طالبدا و ڕومان کردە ئێرە – دەستی بەرەو شام درێژ کرد– دو ڕکات دو ڕکات نوێژمان دەکرد هەتا ئەوکاتەی کە گەڕاینەوە، سەیری کوفەمان دەکردو نوێژ داهات و وتیان، ئەی ئەمیری موسڵمانان ئەمە کوفەیە نوێژ بکەینە چوار ڕکات؟ وتی: نەخێر هەتا بچینە ناو کوفەوە، (ابن حجر) دەفەرموێت: (لا حتی ندخلها، ای لانزال نقصر حتی ندخلها فإنا مالم ندخلها في حكم المسافرين) واتە: (لاحتی ندخلها) واتە: ئێمە بەردەوام نوێژ کورت دەکەینەوە هەتا ئەچینە ناو کوفەوە، وەئێمە هەتا دەچینە ناو کوفەوە لەحوکمی (مسافر)داین. فتح الباري 3/278-279.

## دەیەم / نوێژی (مسافر) لە پشت ئیمامێکی نیشتەجێ (مقیم)ەوە..؟

موسی کوڕی سەلەمە لەعبداللە ی کوڕی عباسی پرسی کەلەمەککە بوین وتم: ئێمە ئەگەر لەگەڵ ئێوەدا نوێژمان کردچوار ڕکات نوێژ دەکەین، بەڵام ئەگەر گەڕاینەوە بۆ شوێنەکانمان دو ڕکات نوێژ دەکەین، ئەویش فەرموی: ئەوە سوننەتی پێغەمبەری خوایە ﷺ (أبوعوانه) ڕیوایەتی کردوە لەصحیحەکەیدا، کەواتە ئەگەر جەماعەت هەبو ئەبێت لەگەڵ جەماعەتدا نوێژەکەت بکەیت، ئەگەر چی (مسافر)یش بیت، نابێت بەتەنها نوێژ بکەیت،بەڵام ئەگەر بەتەنها نوێژت کرد ئەوا دو ڕکات نوێژ دەکەیت هەروەك پرسیار لە عبداللە ی کوڕی عباس

کرا، چۆن نوێژ بکەم ئەگەر لەمەککە بوم ولەگەڵ ئیمامدا نوێژم نەکرد؟ فەرموی: دو ڕکات سوننەتی پێغەمبەرە ﷺ . صحیح مسلم2/143-144 ،سەیری إرواء الغلیل 3/21 بکە .

## یانزەیەم/ حوکمی ئەو کەسەی کە (مسافر)ەو دو ڕکات نوێژ دەکات لە پشت ئیمامێکەوە کە چوار ڕکات دەکات !

ئەم حاڵەتە زۆر برا بەبۆچونی خۆی کردویەتی، بۆ نمونە: خۆی(مسافر)ە دو ڕکات دەکات لەگەڵ ئیمامێکدا کە چوار ڕکات دەکات ، کاتێك ئیمامەکە دەگاتە تەحیاتی یەکەم وهەڵدەستێتەوە بۆ ڕکاتی سێیەم ئەم (مسافر)ە سەربەخۆ سەلام دەداتەوە، بگرە هەیە سەلام دەداتەوەو بەپەلەپەل ولەگەڵ ڕکاتی سێیەمی ئەواندا نیەتی دو ڕکاتی عەسریشی لێ دێنێ، جا ئەم حاڵەتانە هیچی دروست نی‌یە، تەنانەت ئەگەر لەتەحیاتی کۆتایش نوێژ دابەستی لەگەڵیاندا پێویستە چوار ڕکات بکەیت، هەندێکی تریش بەعەمدی خۆیان دوا دەخەن لەنوێژی جەماعەت بەبەڵگەی ئەوەی (مسافر)ن، بەڵام ئەوە لەڕاستیدا تەمەبەڵیە لەعبادەتدا، ئەگینا سوننەتی پێغەمبەر ﷺ لەنوێژی تریشدا هەر بەکۆمەڵ خۆی وهاوەڵانی نوێژیان کردوە، لەبەر ئەوە با هەمو کەسێك ئاگای لەخۆی بێت وتەمەڵ نەبێت لەپەرستنەکاندا، بەڵگەشمان بۆ ئەم حاڵەتە ئەوەیە کە (بیهقی) ڕیوایەتی دەکات (157/3) بە(سند)ێکی (صحیح) لە(أبومجلز)ەوە دەفەرموێت: وتم بە عبدالله ی کوڕی عمر (مسافر)ێك فریای دو ڕکاتی کۆمەڵێکی نیشتەجێ دەکەوێت، ئایا دو ڕکاتەکە بەسە بیکات، یان وەك نوێژەکەی ئەوان دەکات؟ دەفەرموێت: عبدالله ی کوڕی عمر پێکەنی و وتی: بەنوێژەکەی ئەوان نوێژ دەکات. إرواو الغلیل 22/3 .

هەروەها پرسیاریان کرد لە (ابن تیمیە) کە کۆمەڵێك نوێژی نیوەڕۆ دەکەن بەجەماعەت، کەسێکیش ویستی نوێژی بەیانی بکاتەوە بەقەزا لەگەڵیاندا، کاتێ ئیمام هەڵدەستێتەوە ئەو سەلام دەداتەوە، ئایا ئەم نوێژە تەواوە، وەچ بۆچونێك بەڕاستی دەزانێت؟

(ابن تیمیە)ش لەوەڵامدا فەرموی: ئەم نوێژە دروست نییە لەبۆچونی ابو حنیفەو پێشەوا مالك وپێشەوا ئەحمەد لەڕیوایەتێکیدا بەڵام لای پێشەوا شافعی دروستەو لای پێشەوا ئەحمەدیش لەڕیوایەتەکەی تریدا . مجموعة الفتاوی 220/23 .

هەروەها بەڵگەیەکی تریشمان هەیە کە پێشەوا مالك لە(نافع)ەوە ئەویش لە عبدالله ی کوڕی عمرەوە دەگێڕێتەوە کە عبدالله ئەگەر نوێژی لەدوای ئیمامێکەوە بکردایەوخۆی (مسافر) بوایەو ئیمامیش نیشتەجێ، چوار ڕکاتی لەدوای ئەو ئیمامەوە دەکرد، بەڵام ئەگەر خۆی بەتەنها نوێژی بکردایە ئەوا دو ڕکاتی دەکرد. الموطا 150/1 .

هەروەها لەفەتوایەکی (اللجنة الدائمة)ی سعودیەدا هاتوە کەسێك پرسیار دەکات ودەڵێت: هاتم بۆ مەککە بەنیەتی حەج وعەمرە ولەنێوان نوێژی نیوەڕۆو عەسردا چومە ناو حەرەمەوە بۆ ئەوەی کە (طواف) بکەم و لەوکاتەدا بانگی عەسرو قامەت بۆ عەسر هاتە پێشەوە منیش نوێژی نیوەڕۆم نەکردبو نیەتم هێنابو لەگەڵ عەسردا کۆی بکەمەوە، دەست کرا بەنوێژی عەسرو منیش لەنێوانیاندا مامەوەو بوارم نەبو لەوکاتەدا نوێژەکانم بەتەرتیب بکەم، نیەتی دو ڕکات نوێژی نیوەڕۆو دو ڕکات نوێی عەسرم هێنا لەگەڵ جەماعەتدا، وەدوای ئەوەی نوێژمان تەواو کردو (طواف)ەکەم تەواو کرد، لەحەرەم هاتمە دەرەوەو نوێژەکەم کردەوە بەتەرتیب دو ڕکات نیوەڕۆو دو ڕکات عەسر، حوکمی ئەم نوێژەی کەمن کردومە بەم شێوازە چییە؟ .

وەڵام: .. باشتر وابو بۆت لەو کات وساتە تەسکەدا کە خۆت باست کرد، نوێژت

بكردايه لەگەڵ جەماعەتدا بەنيەتی نيوەڕۆو پاشان نوێژی عەسرت بكردايه بە( قصر ) واتە: دو ڕكات، وەهەروەها لەوەڵامی ئەم پرسيارەدا هاتوەو پەيوەندی بەباسەكەمانەوە هەيە كە كردنی نوێژە بە( قصر ) لەدوای كەسێكەوە كە ( إتمام ) دەكات بۆ ئەم شێوازە لەوەڵامدا فەرمويانە دروست نيە ( جائز ) نی‌يه ئەو نوێژە بەم شێوەيە .اللجنة الدائمة

پێشەوا شنقيطی ئەفەرموێت ( اجماع العلماء على ان المسافر اذا اقتدى بمقيم لزمه الاتمام ولو كان القصر واجبا لما جاز صلاة اربع خلف الامام 363/1 واتە : كۆ ڕای زانايان لەسەر ئەوەيە كە موسافر ئەگەر لەدوای نيشتە جێيەكەوە نوێژی كرد پێويستە چوار بكات جا ئەگەر نوێژ كورت كردنەوە واجب بوايە دروست ئەبو بەدوای ئيمامەوە چوار ركات بكات .

## دوانزەيەم/ حوكمی نوێژی سوننەت لەسەفەردا :.

جەماوەری زانايان لەسەر ئەوەن كە كردنی سوننەتەكان لەسەفەردا دروستە بۆ ئەو كەسەی كە نوێژی كورت دەكاتەوە، هەروەها دروستيشە كەنەيكات بەو مەرجەی تەمەڵی لەپەرستنەكاندا نەبێت، بەڵام لەهەمان كاتدا هەمويان يەكدەنگن لەسەر سوننەتێتی سوننەتە ( مطلق )ەكان، واتە : ئەو سوننەتانەی كە ڕاتب نين، هەروەكو پێشەوا ئەووی لەشەرحی ( صحيح )ی مسلم دا باسی كردوە، تحفة الاحوذي 96/3.

بەڵگەی ئەوەی كە دروستە لەسەفەردا ئەو سوننەتانە نەكەيت كە لەگەڵ فەرزەكاندان عبدالله یكوڕی عمر دەفەرموێت: هاوەڵی پێغەمبەرم كردوە ﷺ لەسەفەردا لەدو ڕكاتە فەرزەكە زياتر هيچی تری نەدەكرد، هەروەها ئەبوبەكرو عمرو عوسمايش بەهەمان شێوە، خوايان لێ ڕازی بێت، پێشەوا بوخاری ڕيوايەتی كردوە لەگەڵ ( باب من لم يتطوع في السفردبر الصلاة وقبلها ) فتح البارى 288/3.

هەروەها پێشەوا ئەحمەدی کوڕی حەنبەل لەمسندەکەیدا دەیگێڕێتەوە کە پێغەمبەر ﷺ لەسەفەردا لە پێش نوێژە فەرزەکەو دوایەوە هیچ نوێژێکی تری نەدەکرد، دیارە نوێژی چێشتەنگاو شەو نوێژو دو ڕکاتی پێش نوێژی بەیانی کردوە، وەك دێینە سەری، بۆ ئەوەی یەکێك ئەیکاتە بەڵگە لەسەفەردا، شەو تابەیانی بخەوێت، یان بە هیچ شێوەیەك نوێژی چێشتەنگاو نەکات، یان سوننەتی دەست نوێژ یان ( تحیه المسجد ) ..

پێشەوا بوخاری دەفەرموێت: باب (من تطوع في السفر في دبر الصلاة وقبلها وركع النبي ﷺ ركعتى الفجر في السفر) واتە: ئەوەی کە سوننەت دەکات لەسەفەردا لەغەیری دوای نوێژە فەرزەکان وپێشیان، وەپێغەمبەر ﷺ دو ڕکاتەکەی پێش نوێژی بەیانی کردوە، عبداللە ی کوڕی عامر لەباوکیەوە ئەیگێڕێتەوە کە پێغەمبەرم ﷺ بینیوە کە شەو نوێژی کردوە لەسەفەردا لەسەر پشتی وڵاخەکەی بۆ هەر شوێنێك بڕۆیشتایە . فتح البارى 290/3 . پێشەوا ئەحمەد ڕیوایەتی کردوە لە (مسند)ەکەیدا ژمارەی فەرمودەکە (15118) هەروەها پێغەمبەر ﷺ لەڕۆژی فتحدا هەشت ڕکات نوێژی چێشتەنگای کرد. فتح البارى 290/3 .

هەروەها (أبو داود)و (ترمذى) لەبڕانی کوڕی عازبەوە کە دەفەرموێت: ( هەژدە جار سەفەرم لەگەڵ پێغەمبەر ﷺ کردوە نەمبینیوە دو ڕکاتی پێش نیوەڕۆ وازی لێ بێنێت، ئەم فەرمودەیەش پێشەوا بوخاری بە(حسن)ی لەقەڵەم داوە، هەروەکو پێشەوا (ترمذى) لێوەی دەگێڕێتەوە، سەیری تحفة الاحوذى 95/3 بکە . هەروەها پێشەوا مالك دەفەرموێت: لە(باب: صلاة النافلة في السفر بالنهار والليل والصلاة على الدابة) واتە: باسی نوێژی سوننەت لەسەفەردا بەڕۆژو بەشەو نوێژ کردن لەسەر وڵاغ .

پێشەوا مالك دەفەرموێت: پێم گەیشتوە کە (قاسم)ی کوڕی محمدو عروەی کوڕی زبێرو (ابوبکر)ی کوڕی عبدالرحمن، کە لەسەفەردا سوننەتیان دەکرد ( یحیى )

دەفەرموێت: پرسیار کرا لە پێشەوا مالك دەربارەی سوننەت لەسەفەردا ، وتی: دروستە لەشەو ڕۆژا وە پێم گەیشتوە کە هەندێك لەزانایان سوننەتیان کردوە الموطا 150/10 . کەواتە ماوەتەوە سەر ئەوەی کە چۆن ئەو فەرمودانە ڕێك بخەین، بەتایبەتی فەرمودەکەی عبدالله ی کوڕی عمر، کە کۆمەڵێکی بینی سوننەتیان دەکرد وتی: ئەوە چی دەکەن؟ وتیان: نوێژی سوننەت دەکەین، وتی: ئەگەر سوننەتم بکردایە چوار ڕکاتم دەکرد، سەیری (إرواء الغليل) بکە فەرمودەی ژمارە (563) 3/3 .

ابن قيم دەفەرموێت: (سەبارەت بەسوننەتەکانی پێش نوێژە فەرزەکان ودوایان لەسەفەردا، پێشەوا ئەحمەد دەفەرموێت: کردنی نوێژە سوننەتەکان لەسەفەردا ئاساییەو هیچی تیادا نی‌یە – واتە: دروستە- وەلە (حسنی بصری)یشەوە ڕیوایەت کراوە کە دەفەرموێت: هاوەڵەکانی پێغەمبەری خوا ﷺ سەفەریان دەکردو پێش نوێژە فەرزەکان و دوایان نوێژی سوننەتیان دەکرد، ئەمەش(واتە: کردنی نوێژی سوننەت لەسەفەردا) ڕیوایەت کراوە لە پێشەوا (عمر وعلی وجابر ومسعود وانس وابن عباس وابوذر)و کۆمەڵێکی زۆر لەتابیعیەکان، ئەمەش وتەی پێشەوا (مالك وشافعی ونیسحاق وابو ثور وابن المنذر)ە ، بەڵام (ابن عمر) سوننەتی نەدەکرد لەسەفەردا نەلە پێش فەرزەکان ونەلەدوای فەرزەکانەوە، تەنها لەشەودا نەبێت ئەویش شەو نوێژی دەکرد، ئەمەش لە(سعيد)ی کوڕی (مسيب)و (سعيد)ی کوڕی جبیر) وعلی کوڕی حسین، ئەویش لەبەر ئەو ڕیوایەتەی کەلە (ابن عمر)ەوە دەگێڕنەوە کەلە پێشەوە باسمان کرد..

بەڵگەش لەسەر بۆچونی کۆمەڵی یەکەم (ئەوانەی کە پێیان وایە سوننەت لەسەفەردا دەکرێت) ئەوەیە کە (ابن عباس) دەفەرموێت: پێغەمبەر ﷺ نوێژی فەرزی کرد لە نیشتەجێیدا ونێمەش لە پاش ولە پێشیانەوە نوێژی سوننە تمان دەکرد، هەروەها ئێمە لەسەفەریشدا نوێژی سوننە تمان دەکرد لە پاش و پێشی

نوێژە فەرزەکانەوە، (ابن ماجە)ڕیوایەتی کردوە، هەروەها ڕیوایەتەکەی بڕانی کوڕی عازبیش کەلە پێشەوە باسمان کرد، بەڵگەیە بۆ کۆمەڵی یەکەم، جانەم ڕیوایەتانە وڕیوایەتەکەی (حسنی بصری) بەڵگەن لەسەر ئەوەی کە دروستە کردنی نوێژی سوننەت لەسەفەرداو فەرمودەکەی (ابن عمر)یش بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کە دروستە تەرك کردنی نوێژی سوننەت لەسەفەردا، بەم شێوەیە دەتوانین کار بە هەمو ڕیوایەتەکان بکەین وڕێکیان بخەین، والله أعلم. المغنی2/141-142 وزاد المعاد 1/456-457 وعون المعبود 4/64 وفقه السنة 1/288.

بەلاَم ئەوەی جێی تێڕامانە - هەرلە (ابن عمر)ەوە ڕیوایەت هەیە لەسەر کردنی سوننەت لەسەفەردا لەوانەش (ابن عمر) دەفەرموێت: نوێژم کرد لەگەڵ پێغەمبەری خوادا ﷺ نوێژی نیوەڕۆ لەسەفەردا بەدو ڕکات پاشان لەدوایشیەوە دو ڕکات، پێشەوا (ترمژی) دەفەرموێت: ئەم فەرمودەیە فەرمودەیەکی (حسن)ە هەروەها (ابن عمر) دەفەرموێت: نوێژم کردوە لەگەڵ پێغەمبەری خوادا ﷺ لەکاتی نیشتەجێی ولەکاتی سەفەردا - لەکاتی نیشتەجێیدا دو ڕکاتم دەکرد لە پێشیەوە ودو ڕکاتیش لە پاشیەوە، ولەسەفەریشدا نوێژی نیوەڕۆم کرد لەگەڵ پێغەمبەردا ﷺ بەدوڕکات ولەلەدوایشیەوە دو ڕکات- نوێژی عەسریشم کرد لەگەڵیاندا هەر بەدو ڕکات ولەدوایشیەوە هیچ نوێژی نەکرد، ونوێژی (مغرب)یشم کردوە لەگەڵ پێغەمبەردا ﷺ بەسێ ڕکات لەنیشتەجێی ولەسەفەردا وەکو یەك و(مغرب)یش ویتری ڕۆژە، پاشان لەدوایشیەوە دو ڕکاتم کرد لەگەڵ پێغەمبەردا ﷺ واتە: لەدوای (مغرب)ەوە پاشان پێشەوا (ترمذی) دەفەرموێت: ئەم فەرمودەیە فەرمودەیەکی (حسن)ە، وەبیستومە لە پێشەوا بوخاریەوە کە دەیفەرمو: (ابن ابی لیلی) هیچ فەرمودەیەکی ڕیوایەت نەکردوە وەکو ئەم فەرمودەیەی بەلامەوە (باش) بێت، تحفة الاحوذی 3/97-98.

لەکۆتایدا ئەوەی کەماوە کەلەم خاڵەدا باسی بکەین ئەوەیە کە زانایان یەکدەنگن لەسەر تەرك کردنی نوێژی سوننەت لە(مزدلفه)دا، هەروەکو (ابن

المنذر) باسی کردوه .. (نقل ابن المنذر الاجماع على ترك التطوع بين الصلاتين بالمزدلفة) نيل الاوطار و(الثمرات الجياد) مەبەستیش لەم خاڵەدا زیاد کردنی پەرستنەکانمانە وتەمەڵی نەکردنە لەنوێژەکان ودەست کەوتنی پاداشت ونزیك بوونەوەیە لەخوا (لايزال عبدي يتقرب الىّ بالنوافل حتى أحبه) رواه مسلم .

هەروەها عبدالله ی کوڕی عمر ڕەزای خوایان لێ بێت عبیدالله ی کوڕی سوننەتی دەکرد نینکاری نەدەکرد، وەك پێشەوا مالك دەفەرموێت: (بلغني عن نافع ان عبدالله بن عمر كان يرى ابنه عبيدالله يتنفل في السفر فلا ينكر عليه) واتە: پێم گەیشتوە لە نافعەوە کەعبدالله ی کوڕی عمر عبیدالله ی کوڕی سوننەتی لەسەفەردا دەکرد نینکاری لێ نەکرد. سەیری (الترغيب والترهيب) بکە .مشكاة المصابيح 423/1

## سیانزەهەم / ئایا نوێژی فەرز لەناو تەیارەو سەیارەدا دەکرێت؟ .

بنچینەو (أصل) وایە کەپێغەمبەر ﷺ لەسەفەردا ئەگەر سوننەتی بکردایە لەسەر وڵاخەکەی دەیکرد، هەروەها شەو نوێژیشی لەسەر وڵاخەکەی دەکرد، ئەویش بەم شێوەیە دەکرێت کە سەرت لەسەر وڵاخەکە دانەنێیت، بەڵکو دەبێت رکوع وسجودەکە هەر بەسەر بێت وبەئیشارەت، هەروەك لە(أنس)ەوە لەپێغەمبەری خواوە ﷺ ڕیوایەت کراوە. بڕوانە (عون المعبود) 66/4 و(زاد المعاد) 329/1 .

زانا (ابو الطيّب) کە شەرحی (سنن)ی (ابوداود)ی کردوە دەفەرموێت:

( . بەکورتی کردنی نوێژە فەرزەکان لەسەر وڵاخ دروستە لەکاتی بونی عوزردا لەو عوزرانەش: باران وترس لەدوژمن وگیانداری دڕندەو نەتوانینی دابەزین لەسەر وڵاخەکە لەبەر لاوازی..) (عون المعبود) 66/4 . هەروەها ئەم زانا بەڕێزە

لەشوێنێکی تردا هەر لەم بارەیەوە دەفەرموێت: ( .. دروستە کردنی نوێژی فەرز بەسەر وڵاخەوە، ئەویش لەبەر ئەو ڕیوایەتەی کە پێشەوا ئەحمەد لە(مسند)ەکەیدا و(دار القطنی) و(ترمذی) و(النسائی) و(یعلی)ی کوڕی (مرّة)ەوە ڕیوایەتیان کردوە بەم شێوەیە کە پێغەمبەری خواو ﷺ هاوەڵەکانی گەیشتنە شوێنێك کە ئاوی تێدا بو لەنێوان دو پارچە زەویداو شوێنەکەش تەسك بو، جا پێغەمبەر ﷺ لەسەر وڵاخەکەی بو سەریان باران بو ژێریشیان تەڕایی بو، کاتی نوێژ هات و پێغەمبەریش ﷺ فەرمانی کرد بەبانگ بێژ کە بانگ بدات وقامەت بکات، پاشان پێغەمبەر ﷺ پێش کەوت ونوێژی بۆ ئەو هاوەڵانەی کرد کەلەگەڵیدا بون، بەئیشارەت بەڵام لەکاتی (سجود) دا سەری زیاتر دائەنەواند وەك لەکاتی (ركوع) دا پێشەوا (ترمذی) دەربارەی ئەم فەرمودەیە دەفەرموێت: (حديث غريب تفرد به عمرو بن ميمون بن الرماح البلخي لايعرف الامن حديثه، وقد روى عنه غير واحد من أهل العلم) پاشان دەفەرموێت: هەر لەم بارەیەوە ڕیوایەت کراوە لە(أنس)ی کوڕی مالکەوە کە نوێژی کردوە لەسەر وڵاخەکەی لەناو ئاو و قوڕدا، زانایانیش ئیش لەسەر ئەمە دەکەن وئەمەش بۆچونی پێشەوا ئەحمەدو ئیسحاقە .اهـ ، (ابن تيميه) لە(شرح الاحكام)دا دەفەرموێت: ئەم فەرمودەیە وانای فەرمودەکەی پێشوی پێشەوا (عبدالحق) بە (صحیح)ی لەقەڵەم داوەو پێشەوا ئەوەویش دەفەرموێت: (حسن)ە و(بیهقی)یش دەفەرموێت: لاوازە، فەرمودەکەش بەڵگەیە بۆ ئەو زانایانەی کە دەفەرمون نوێژی فەرز دروستە بەسەر وڵاخەوە هەروەکو چۆن لەناو کەشتیدا دروستە بە کۆڕاویەکدەنگی زانایان، .هەروەها لەشوێنێکی تردا لە(شرح الاحكام) دا دەفرموێت: ئەم فەرمودەیە بەڵگەیە لەسەر دروستێتی کردنی نوێژی فەرز بەسەر وڵاخەوە، وەهەندێ لەو مەرجانەشی کەلەلایەن هەندێکەوە بەمەرج گیراوەبۆ کردنی نوێژی فەرز بەسەر وڵاخەوە هیچ بەڵگەیان لەسەر نیە تەنها هەندێ (عموم)یات نەبێت، بەم فەرمودەیە تایبەت دەکرێن، وەئەوەشی کەلەفەرمودەکەدا هاتبێت

تەنها عوزری باران وتەڕی زەویيە، جا ئەوەی بەهێز بێت ئەوەيە کەدروستە کردنی نوێژی فەرز بەسەر وڵاخەوە لەسەفەردا بۆ کەسێك ئەو عوزرەی هەبێت کەلەفەرمودەکەدا هاتوە تادەگاتە ئەو شوێنەی کە دەفەرموێت پێشەوا (ترمذی) ڕیوایەتی کردوە لە پێشەوا ئەحمەدو ئیسحاقەوە، کەدەفەرمون: دروستە کردنی نوێژیفەرز بەسەروڵاخەوە ئەگەر (مسافر) هیچ شوێنێکی نەبینیەوە بۆ ئەوەی دابەزێت ونوێژەکەی بکات. بڕوانە (عون المعبود) 4/67-68 .شرح حدیث رقم 1225 .

هەر لەم بارەیەوە لیژنەی فەتوای سعودی چەند فەتوایەکی هەیە لەوانە:

1- پرسیاری یەکەم لە فەتوای ژمارە (5926) دا ، پرسیارەکە بەم شێوەیە: دروستە کردنی نوێژ بەسوارییەوە لەسەر وڵاخ، لەکاتێکدا من حاڵم وابوە،کەمن لەشوێن وجێگایەکدا بوم کەجێی ترسە؟ وەڵامەکەی: دروستە کردنی نوێژی فەرز بەسوارییەوە لەسەر وڵاخ، جا وەستاو بێت یان ڕێ بکات، ئەمیش لەبەر بونی عوزرەکانی وەکو قوڕو باران وهاوشێوەکانیان، بەڵگەش لەسەری فەرمودەکەی (یعلی)ی کوڕی (مرّة)یە کە لە پێشەوە باسمان کرد .. هەروەها دروستە کردنی نوێژی فەرز لەسەروڵاخ، ئەگەر بێت وئەو کەسە بترسێت لەوەی کەلەسەفەرەکەی دوا دەکەوێو هاوەڵەکانی بەجێی بهێڵن، یان بترسێ لە دوژمن کەزیانی پێ بگەیەنن، یان نەتوانێ دابەزێ، بەڵام پێویستە لەسەر ئەو کەسەی کە نوێژ لەسەر وڵاخ دەکات ڕو بکاتە (قبلة) چەندێك دەتوانێ، وەپێویستیشە لەسەری کە (رکوع)و (سجود) ببات. بەڵام (سجود)ەکەی نزمتر بێت لە(رکوع)ەکەی، لەبەر ئەو فەرمودەی کەلە پێشەوە هێناومانەوە، هەروەها لەبەر ئەوەی کە خوای گەورە کە دەفەرموێت:﴿ فَاتَّقُوا اللَّهَ مَا اسْتَطَعْتُمْ﴾ وبالله التوفیق 8/125-126 . فتاوی اللجنة الدائمة .

فەتوای ژمارە (2645)، کورتەو پوختەی پرسیارێکە ئەوەیە کە دەڵێت: حوکمی کردنی نوێژی فەرز لەناو تەیارەدا؟

وەلامەكەی: دروستە بۆ موسلمان كە نوێژ بكات لەناو تەیارەدا، لەبەر گشتێتی ئەو بەڵگانەی كە بەڵگەن لەسەر واجبێتی كردنی نوێژ ئەگەر كاتەكەی هاتە پێشەوە، وەجیاوازیش نی‌یە لەنێوان وشكایی و بەحرو بون لەوشكانیدا، جا ئەو كەسەی كە نوێژ دەكات لەناو تەیارەدا پێویستە لەسەری ڕو بكاتە (قبلة) چەندێك لەتوانایدا هەیە، جا ئەگەر تەیارەكە ڕێڕەوەكەی خۆی لە(قبلة) لایدا لەكاتی نوێژی (مسافر)ەكەدا، ئەوا (مسافر)ەكە بەردەوام دەبێت لەنوێژەكەیدا وهەتا بتوانێت وبۆی بكرێت، ئەگەر تەیارەكە لایداو ئەم چەندی پێ كرا ڕوی كردە (قبلة) ئەوا ئەو كەسە هیچ تاوان وگوناهێكی لەسەر نی‌یە، لەبەر گشتێتی ئەو بەڵگانەی كەبەڵگەن لەسەر ئاسانی شەریعەتی ئیسلام لەوانەش:﴿ لاَ تُكَلَّفُ نَفْسًا إِلاَّ وُسْعَهَا﴾ وبالله التوفيق .. 128/8 . فتاوى اللجنة الدائمة .

جالەژێر ڕۆشنایی ئەو فەرمودەی كەلەسەرەوە هێنامانەوە لەگەڵ وتەی ئەو زانایانەی كەلەسەر فەرمودەكە هێنامانەوە بۆمان ڕون دەبێتەوە كە نوێژ كردن لەناو تەیارەو قیتاردا هەمان حوكمی هەیە، چونكە ناتوانی دابەزیتە سەر زەوی بیكەیت، هەروەها ئاساییە كردنی نوێژی فەرز لەناو تەیارەدا لەكاتی جیهاددا، چونكە جۆرێكە لەجۆرەكانی ترس، خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿فَإِنْ خِفْتُمْ فَرِجَالاً أَوْ رُكْبَانًا﴾ والله تعالى أعلم . سەیری (المدونة الكبرى) بكە 117/1 .

## چوارەدەیەم / بانگ دان لەسەفەردا :

لەعوقبەی كوڕی (عامره)وە كە دەفەرموێت: بیستم لە پێغەمبەری خوا ﷺ كە دەیفەرمو: خوای گەورە پێی خۆشە كاتی كە شوانێ لەگەڵ مەڕو ماڵاتێك لەسەر شاخێك بانگ دەدات بۆ نوێژو نوێژ دەكات لەو شوێنەدا، پاشان خوای پەروەردگار دەفەرموێت: سەیری بەندەكەم بكەن كە چۆن بانگ دەدات وقامەت دەكات بۆ نوێژەكەی ئەوەشی كەوای لێ كردوە ترسیەتی لەمن، ئەوا منیش لێی خۆش بوم وخستمە بەهەشتەوە. سەیری (عون المعبود) بكە .50/4 .

عن مالك بن الحويرث قال اتى رجلان النبي ﷺ يريدان السفر فقال النبي ﷺ اذا انتما خرجتما فاذنا ثم اقيما ثم ليؤمكما اكبركما ) رواه البخاري ، الموطء 50/4

## پانزەیەم / قورئان خوێندن لە سەفەردا :

لەبەرڕانی کوڕی عازبەوە دەفەرموێت: دەرچوین لەگەڵ پێغەمبەری خوادا ﷺ لەسەفەرێك لەسەفەرەکانیدا، نوێژی عیشا هاتە پێشەوەو نوێژەکەی بۆ کردین ولەیەکێك لەرکاتەکانیشیدا (والتين والزيتون)ی خوێند، رواه أبوداود. پێشەوا (ترمذي) دەفەرموێت: پێشەوا بوخاری ومسلم والنسائی و ابن ماجە بەهەمان شێوە ڕیوایەتیان کردوە. (عون المعبود) 63/4 فەرمودەی ژمارە (1218).

هەر لەم بارەیشەوە فەرمودەی ترمان هەیە کە پێغەمبەر ﷺ لەسەفەرێك لەسەفەرەکایدا هەردو سورەتی (الفلق)و (الناس)ی خوێندەوە، جا لەم ڕیوایەتانە کە لەپێغەمبەرەوە ﷺ پێمان گەیشتوە بۆمان دەردەکەوێت کە سوننەتە لەسەفەردا ئەو قورئانەی کە دەخوێنرێت لەنوێژەکاندا کەم بێت . والله أعلم. سەیری (صفة الصلاة) بکە . بەلاّم خوای گەورە پێی خۆشە لە سەفەردا شەو نوێژ بکەیت و قورئانی زۆری تیا بخوێنی واتە بۆخۆت بەتەنها بۆت هەیە نوێژەکە درێژ بکەیتەوە پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت : ( ثلاثة يحبهم الله ، وثلاثة يشنؤهم الله : الرجل يلقى العدو في فئة فينصب لهم نحره حتى يقتل او يفتح لأصحابه ، والقوم يسافرون فيطول سراهم حتى يحبوا ان يمسوا الارض ، فينزلون فيتنحى احدهم حتى يوقضهم لرحيله والرجل يكون له الجار يؤذيه جاره فيصبر على اذاه حتى يفرق بينهما موت او ظعن والذين يشنؤهم الله التاجر الحلاف والفقير المختال والبخيل المنان ) صحيح الجامع الصغير 17/2

## شانزەهەم / ئەگەر کەسێك لەتەیارەدا بو کاتێك لەشوێنێکەوە بۆ شوێنێکی تر سەفەر بکات وهەر ڕۆژ بێت،

## ئایا ئەم کەسە چی بکات سەبارەت بە نوێژە فەوتاوەکانی شەووەوە:

ئەم سەرباسە کورتەی پرسیارێکە کە کەسێك کردویەتی لەلیژنەی فەتوای سعودی، کاتێك سەفەری کردوە لەئەمەریکاوە بۆ یابان ولەوێیشەوە بۆ (ئەندۆنیسیا)و شەوی بەسەردا نەهاتوە، تەنها ڕۆژی بینیوە کاتێك گەیشتوەتە هەر وڵاتێك لەو وڵاتانە، جالیژنەش بەم شێوەیە وەڵامی داوەتەوە:

پرسیاری یەکەم لەفەتوای ژمارە ( 13503 ) وەڵامەکەی: پێویستە لەسەر ئەم کەسە کە حاڵی ئاوا بوە ئەو نوێژانەی کە ڕۆشتوە بیگێرێتەوە دەست بەجێ، بەڵام سەبارەت بە داهاتووەوە- واتە: ئەگەر هەمان حاڵەت بەسەردا هات - ئەوا پێویستە هەمو نوێژێك لەکاتی خۆیدا بکەیت ئەویش بەدیاری کردنی کاتەکانی نوێژو خەملاندنی بەسەعات، ئەگەر چی هەر لەناو تەیارەکەشدا بێت، فتاوی اللجنة الدائمة 105/8 .

## حەڤدەیەم / ئەگەر کەسێك پێش سەفەر کردنی کاتی نوێژی نیوەڕۆ یان عەسر یان عیشای بەسەرداهات و پاشان دەستی کرد بەسەفەرەکەی ونوێژەکەی نەکرد لەشوێنی خۆی ئایا ئەم کەسە نوێژەکەی بە(قصر) دەکات یان بە (إتمام)؟.

دیسان ئەم سەرباسەش کورتەی پرسیاری کەسێکی سعودیە کە کاتێ نوێژی عیشای بەسەردا هاتوە پاشان سەفەری کردوەو نوێژی عشیای لەشوێنی خۆی نەکردوەو کاتێ گەشتوەتە ئەو شوێنەی کەسەفەرەکەی بۆ کردوە نوێژەکەی عیشای بەچوار ڕکات کردوە جا پرسیارەکەی بەم شێوەیە دەڵێت: ئایا دروست بو

بۆم ئەگەر نوێژەکەی عیشام بە( قصر ) بکردایە واتە :-دو ڕکات-؟

لیژنەی فەتوای سعودیش بەم شێوەیە وەڵامی داوەتەوە.

فەتوای ژمارە ( 7553 ) وەڵام: نوێژەکەی عیشات کە بەچوار ڕکات کردوتە تەواوە، بەڵام ئەگەر کورتت بکردایەتەوەو دو ڕکاتت بکردایە باشتر بو بۆت وخێری زیاتر بو . فتاوی اللجنة الدائمة 107/8 .

پێشەوا ( ابن قدامة ) لەم بارەیەوە دەفەرموێت: ئەگەر کەسێك سەفەری کرد دوای ئەوەی کاتی نوێژ هاتبو ئەوا پێشەوا ( ابن عقیل ) دەفەرموێت: دو ڕیوایەتی لەسەرە، یەکەمیان دەڵێت: بۆی هەیە بە( قصر ) بیکات، دوەمیشیان دەڵێت: بۆی نی‌یە بە( قصر ) بیکات، ( ابن المنذر)یش دەفەرموێت: ( ئەو زانایانەی کە ئیمە زانستمان لێ وەرگرتون هەمویان یەك دەنگن لەسەر ئەوەی کەبۆی هەیە ئەم کەسە نوێژەکەی بە( قصر ) بکات، ئەمەش وتەی پێشەوا مالك وئەوزاعی وشافعی وحەنەفیەکانە . ( المغنی مع شرح الکبیر )128/2 .

لەم فەتوایانە ئەوەمان بۆ ڕون دەبێتەوە کە ئەگەر کەسێك ویستی سەفەر بکات وکاتی نوێژێك لەنوێژە چوار ڕکاتیەکانی هات بەسەرداو نەیکرد هەتا دەستی کرد بەسەفەرەکەی ولەسەفەرەکەشیدا کاتی نوێژەکە مابو ئەوا سوننەتە ئەو کەسە ( مسافر )ە نوێژەکەی کورت بکاتەوە نەك وەك خۆی بیکات . والله أعلم

## هەژدەیەم /ئایا دروستە نوێژ لەناو تەیارەدا یان سەیارەدا بەدانیشتنەوە لەبەر شەرم ؟.

ئەم سەرباسەش دیسان کورتەی پرسیارێکە کەلەلیژنەی فەتوای سعودی کراوە وەڵامەکەشی بەم شێوەیە یە :

پرسیاری حەوتەم لەفەتوای ژمارە ( 12087 ) وەڵامەکەی ( دروست نی‌یە نوێژ کردن بەدانیشتنەوە لەناو تەیارەو غەیری تەیارەشدا ئەگەر بتوانی بە پێوە نوێژ

بکەیت، چونکە خوای گەورە دەفەرمویت: ﴿وَقُومُوا لِلَّهِ قَانِتِينَ﴾ هەروەها پێغەمبەری خوا ﷺ بەعیمرانی کوڕی حوصەینی فەرمو: ئەگەر توانیت ئەوا بە پێوە نوێژەکەت بکە ئەگەر نەتوانی بە پێوە بیکەی ئەوا بەدانیشتنەوە بیکە، وەئەگەر نەتوانی بەدانیشتنەوە بیکەیت ئەوا لەسەر لا بە پاڵکەوتنەوە نوێژەکەت بکە لەڕیوایەتێکی پێشەوا( النسائی )دا هاوتوە دەفەرمویت: خۆ ئەگەر نەشتوانی لەسەر لا ئەوا لەسەر پشت نوێژەکەت بکە . وبالله التوفیق فتاوی اللجنة الدائمة. 126/8 .

## نۆزدەیەم / ئەگەر کەسێك لەشوێنی خۆیدا بو خەوت ولەکاتی خەوەکەیدا هەندێ لە نوێژەکانی بڕوات وپاشان سەفەر بکات ئایا لەسەفەرکەی وشوێنی سەفەرەکەیدا نوێژەکانی بە( قصر ) دەکات یان بە( إتمام ) ؟.

ئەم سەرباسەش دیسان کورتەی سەر پرسیارێکە کە لەلیژنەی فەتوای سعودیکراوە، وەڵامەکەشی بەم شێوەیەیە:

پرسیاری پێنجەم لەفەتوای ژمارە ( 8290 ) وەڵامەکەی پێویستە لەسەر ئەو کەسەی کە نیشتە جێیەو خەوتوەو لەکاتی خەوەکانیدا هەندێ لە نوێژەکانی ڕۆیشتوە نوێژەکانی وەکو خۆی بکات ئەگەر چی لەکاتی سەفەرەکەیشیدا بیربیکەوێتەوە، چونکە کاتێ کەلەسەری واجب بوە ئەو نیشتەجێ بوە نەك ( مسافر ) وبالله التوفیق.. فتاوی اللجنة الدئمة 145/8 .

هەر لەم بارەشەوە پێشەوا (إبن قدامة ) لە( مغنی )دا دەفەرمویت: ئەگەر کەسێك نیشتەجێ بو نوێژەکەی بیر چو کەلەشوێنی خۆی بیکات ولەکاتی خۆیدا پاشان سەفەری کردو لەسەفەرەکەیدا بیری هاتەوە ئەوا بەکۆڕای زانایان دەڵێن:

نوێژەکەی بە(إتمام) واتە: وەکو خۆی بکات هەتا دەگاتەنەو شوێنە کە دەفەرموێت: ئەلام ئەگەر کەسێك (مسافر) بێت نوێژەکەی لەسەفەردا لەبیر بچێت دوای ئەوەی کە گەڕایەوە بۆ شوێنی خۆی بیری بکەوێتەوە ئەوا پێشەوا ئەحمەد دەفەرموێت: پێویستە نوێژەکەی بە(إتمام) بکات(احتیاطا) ئەمەش وتەی پێشەوا (ئەوزاعی)و (شافعی)و لەڕیوایەتێك لێوەی، بەڵام پێشەوا (مالك)و (ثوری)و حەنەفیەکان دەفەرمون: نوێژەکەی بە(قصر) دەکات، چونکە ئەو کەسە ئەو نوێژە دەگێڕێتەوە کە ڕۆشتوە، ئەوەشی کەڕۆشتوە دو ڕکاتەئەك چوار. سەیری (المغنی مع الشرح الکبیر) بکە 127/2.

## بیستەم / ئەگەر کەسێك دو ماڵی هەبێت لەدو شاری جیاوازدا، ئایا بۆی هەیە (قصر) بکات کاتێك لەمیانەوە بچێت بۆ ئەویان یان چۆن؟

ئەم سەرباسە کورتەی پرسیارێکە کەلەلیژنەی فەتوای سعودی کراوە، وەلامەکەشی بەم شێوەیە:

پرسیاری چوارەم لەفەتوای ژمارە (6497) وەلامەکەی: ئەگەر حاڵیئەو کەسە ئاوا بێت بەو شێوەیەی کە لە پرسیارەکەدا هاتوە بەوەی کەهەردو ماڵەکەی شوێنی نیشتەجێی بێت، ئەوا ئەو کەسە بۆی نیە وەکو (مسافر) سەیری خۆی بکات وئەو شتانەی کە بۆ (مسافر) ڕێ دراوە بۆ ئەویش ڕێ بدرێت لەکورت کردنەوەی نوێژو غەیری ئەویش، بەلام ئەم کەسە بۆی هەیە وەکو (مسافر) سەیری خۆی بکات کاتێك لەکاتی سەفەرەکەیدایە لەمیانەوە بۆ ئەمیان، ئەگەر بێت وماوەی نێوانیان ئەوەندە بێت کەبشێت بۆ ئەوەی کە نوێژی تیا کورت بکرێتەوە، ئەوماوەیەش نزیکەی (80) کیلۆ مەترە.. وباللە التوفیق .. فتاوی اللجنة الدائمة 147/8.

لەم فەتوایانەوە بۆمان ڕون دەبێتەوە کەئەو کەسە ئەگەر لەهەر ماڵێك لەماڵەکانی بێت ئەوا بۆی نیە نوێژەکانی بە(قصر) بکات، بەڵام لەکاتی سەفەرەکەیدا لەمیانەوە بۆ ئەویان بۆی هەیە نوێژەکانی کورت بکاتەوە والله أعلم.

## بیست ویەکەم / ئەگەر کەسێك نوێژی نیوەڕۆی دوا بخات بۆلای عەسرو پێش ئەوەی کاتی عەسر بێت ئەم کەسە (مسافر)ە بگاتەوە شوێنی خۆی، ئایا نوێژەکەی نیوەڕۆ بە(قصر) دەکات یان چۆن؟.

ئەم سەرباسە کورتەی پرسیارێکە کەلەلیژنەی فەتوای سعودی کراوە، وەلامەکەشی بەم شێوەیەیە:

پرسیاری یەکەم فەتوای ژمارە (6307) وەڵامەکەی:نوێژەکەی نیوەڕۆت وەکو خۆی دەکەیت،واتە چوار ڕکات، چونکە تۆ گەیشتویتەوە شوێنی خۆت پێش ئەوەیکاتی نیوەڕۆت بڕوات وکاتی نوێژی عەسر بێت، جالەبەر ئەوەی حاڵەکە ئاوایە تۆ حوکمی نیشتەجێت هەیە نوێژەکەت بە(إتمام) دەکەیت .. وبالله التوفیق فتاوی اللجنة الدائمة 151/8.

## بیست ودوەم / ئەگەر کەسێك لەسەفەردا بێت وبزانێت نوێژی عیشا دەگاتەوە شوێنی خۆی، ئایا ئەم کەسە بۆی هەیە عیشا لەگەڵ مەغربدا (جمع) بکات ؟.

هەروەهائەم سەرباسە کورتەی پرسیارێکە کەلەلیژنەی فەتوای سعودی کراوە، وەڵامەکەشی بەم شێوەیەیە:

پرسیاری سێیەم لەفەتوای ژمارە (3322) وەڵامەکەی: کاتێك

کەلەسەفەرەکەتدای واجب نییە لەسەرت کەنوێژەکەی عیشات کورت بکەیتەوە وبە( جمع ) لەگەڵ مەغربدا بیکەیت، بەڵکو دەتوانیت نوێژەکەیمەغربت لەکاتی خۆیدا بکەی وعیشاش لەکاتی خۆیدا کاتێ کە دەگەڕێیتەوە شوێنی خۆت بەچوار رکات، بەلام ئەگەر بێت ونوێژەکەی عیشات لەگەڵ مەغربدا کۆبکەیتەوە وکورتی بکەیتەوە لەسەفەرەکەدا هەر دروستە وهیچی تیا نییە، ئەگەر چی بشزانیت کە کاتی نوێژی عیشا دەگەڕێیتەوە شوێنی خۆت، .. وباللە التوفیق ، فتاوی اللجنة الدائمة 152/8 .

## بیست وسێیەم / ئەگەر چەند ( محل ) ێك ( گەرەکێك ) لەشارێکدا هەبون کەسێك لەیەکیانەوە بڕوات بۆ ئەوی تریان ئایا ئەم کەسە بۆی هەیە نوێژەکانی بە ( قصر وجمع ) بکات ؟.

لەم بارەیەوە پێشەوا ( ابن قدامة ) لە ( المغنی )دا دەفەرموێت : ( .. ئەگەر بێت و چەند ( محل )ێك لەشارێکدا هەبون بەشێوەیەك کە هەر ( محل )ەیان سەر بەخۆو جیا بێت لەوانی تر بۆ نمونە وەك شاری (بغداد) ئەوا هەر کەسێك لە( محل )ەیەکیانەوە بڕوات بۆ ( محل )ەیەکی تر، ئەوا ئەو کەسە بۆی هەیە نوێژەکانی کورت بکاتەوە هەر کاتێك ماڵەکانی ( محل )ەکەی خۆی بەجێ هێشت، بەلام ئەگەر بێت و ( محل )ەکان هەندێکیان لکابن بەهەندێکی تریانەوە ئەوا ئەو کەسە بۆی نییە (قصر) بکات هەتا ماڵەکانی هەمو ( محل )ەکان بەجێ نەهێڵێت .(المغنی مع الشرح الکبیر ) 99/2 .

بەلام ئەگەر کەسێك لەشوێنێکدا بو ماڵەکەشی تەنها بو لەو شوێنەدا بۆی هەیە (قصر) بکات هەر کاتێك ماڵەکەی بەجێ بهێڵێت وپشتی تێ بکات هەر وەکو پێشەوا ( ابن قدامة ) لە ( المغنی )دا دەفەرموێت : (وان کان بیته مفردا فمتی یفارق منزله ورحله ویجعله وراء ظهره .. ) المغنی 99/2 .

# بیست وچوارەم / ئەگەر کەسێك ( مسافر ) بێت وببێتە ئیمام بۆ کۆمەڵێك کەهەندێکیان ( مسافر ) بن وهەندێکیان ( مقیم ) و نیشتەجێ بن یان هەمویان ( مسافر )بن ؟.

لەم بارەیەوە پێشەوا ( ابن قدامة ) لە( المغنی ) دا دەفەرموێت: زانایان کۆدەنگن وکۆڕان لەسەر ئەوەی ئەگەر بێت وکەسێك نیشتەجێ بێت ونوێژ بکات لەدوای کەسێکی ترەوە کە ( مسافر )ە ، ئەوا پێویستە ئەو کەسە نیشتەجێیە نوێژەکەی وەکو خۆی بکات کاتێ کە ( مسافر )ەکە لەدوەم ڕکاتدا سەلامی دایەوە، چونکە ڕیوایەت کراوە لەعیمرانی کوڕی حوصەینەوە کە فەرمویەتی: ( شهدت الفتح مع رسول الله ﷺ فاقام بمكة ثماني عشرة ليلة لايصلى الا ركعتين، ثم يقول لأهل البلد صلوا أربعا فإنا سفر .. ) بڕوانە ( المغنی مع الشرح الكبير ) 131/2 .

بەڵام ئەگەر بێت وکەسێك ( مسافر )ەو نوێژ بۆ کەسانێکی تر بکات کە هەر ( مسافر ) بن ، بەڵام ئەم کەسە ( مسافر )ە بیری چو کە نوێژەکە بە( قصر ) بکات ونوێژەکەی بە( إتمام ) بۆ ( مسافر )ەکان کرد، ئەوا نوێژەکەی خۆی وئەوانەشی کە بەدوایەوە بون دروست وتەواوەو پێویستیش بە( سجدة )ی ( سهو ) ناکات، چونکە ئەو زیادەیە زیادەیەکە ئەگەر بە( عمد )یش بکرێت نوێژی پێ بەتاڵ نابێتەوە، هەر وەکو پێشەوا ( ابن قدامة ) دەفەرموێت: ( وان أم المسافر مسافرين فنسي صلاتها تامة صحت صلاته وصلاتهم، ولا يلزم لذلك سجود السهو، لأنها زيادة لايبطل الصلاة عمدها .. ) ( المغنی مع الشرح الكبير ) 132/2 .

بەڵام ئەگەر هەردولا ( مسافر ) بن ئیمام دوم ڕکاتەکەی تەواو کردو هەڵسایەوە بۆ ڕکاتی سێیەم لەسەری واجب نىیە کە ڕکاتی سێیەم بکات و بەردەوام بێت لەسەری، بەڵکو دەتوانێت دابنیشێت وسەلام بداتەوە، وەئەگەر ئەوانەی

لەدوایەوەن و(مأموم)ن زانیان هەڵسانەوەی ئیمامەکەیان لەبەر (سهو) بوە، ئەوا لەسەریان نیە کە شوێنی بکەون بەڵکو (سبحان الله) دەکەن، جا ئەگەر گەڕایەوە ئەوا نوێژەکەیان بەیەکەوە تەواو دەکەن، وەئەگەر ئیمامەکەشیان نەگەڕایەوە ئەوا بۆیان هەیە جیا ببنەوە لە ئیمامەکەیان وسەلام بدەنەوە، وەئەگەر شوێنی ئیمامەکەیان بکەون ئەوا نوێژی هیچ لایەکیان نە ئیمام ونە(مأموم) بەتاڵ نابێتەوە هەروەکو پێشەوا (ابن قدامة) لە(المغنی)دا بەم شێوازە باسی کردوە 132/2 ، بەڵام تەواو کردنیان لەگەڵ ئیمامدا باشترە، چونکە سەلام دانەوە پێش ئیمام (نهي) لێ کراوە وەك پێشەوا (مسلم) ڕیوایەتی دەکات، هەروەها کۆڕای هاوەڵەکان کاتێ (عثمان بن عفان) چوار ڕکاتی کردو هیچ هاوەڵێك سەلامی نەدایەوە، بەڵام ئینکاریان کرد لەو کاتەشدا بەعبدالله ی کوڕی مسعودیان وت: تۆ ئینکاریت کردو چوار ڕکاتیشت کرد، فەرموی: (انی لاکره الخلاف) وەفەرموی: (الخلاف شر کله) پێشەوا بیهقی ڕیوایەتی کردوە . (فتح الباری) 564/2 .

مەبەستمان ئەوەیە سەلام دانەوە دروست نیە لەم کاتەدا (إنما جعل الامام لیؤتم به) هەروەها سوننەتی پێغەمبەر ﷺ ئاوایە کە ئەگەر ئیمام چوار ڕکاتی کرد تۆش چوار بکە . سەیری (إرواء الغلیل) 21/2 (صحیح مسلم) 143/2-144 .

## یەکەم/ کۆکردنەوەی نوێژ دروستە ( جائز )ە

هەروەك ئاشكرایە لەشەرعدا خوای گەورە ویستی وایە كە ئاسان كاری دەوێت بۆ ئیمانداران، هەروەك دەفەرموێت لەئایەتی‌ڕۆژو بۆ (مسافر) ونەخۆش: ﴿ يُرِيدُ اللهُ بِكُمُ اليُسْرَ وَلاَ يُرِيدُ بِكُمُ العُسر﴾ البقرة . ووەدەفەرموێت: ﴿ وَمَا جَعَلَ عَلَيْكُمْ فِي الدِّينِ مِنْ حَرَجٍ﴾، هەروەها پێشەوا ئەحمەد دەگێڕێتەوە لە عبدالله ی كوڕی عباسەوە كە دەفەرموێت: پێغەمبەر ﷺ نوێژی نیوەڕۆو عەسری كۆكردەوە وەمەغرب وعیشایكۆكردەوە بەبێ ئەوەی ترسی هەبێت، یان باران بێت،وترا بە عبدالله ی كوڕی عباس بۆچی پێغەمبەر ﷺ وایكرد، ئەویش فەرموی: بۆ ئەوەی كە ئومەتەكەی ناڕەحەت نەكات. رواه البخاری ومسلم واحمد. بڕوانە (إرواء الغليل) 36/3.

هەروەها زۆربەی زانایان لەهاوەڵانی پێغەمبەرو ﷺ شوێن كەوتوانی لەسەر ئەوەن كە كۆكردنەوەی نوێژ دروستە ئەمەش بۆچونی پێشەوا شافعی و ئەحمەد و(ثوری)ە ، بڕوانە ( المغنی مع شرح الكبير) 112/2، و(الروضة الندية) 102/1 ، و(نيل الاوطار) 212/3 .

## دووەم / پێناسەی (الرخصە)

بۆ ئەوەی زیاتر لەباسی كۆ كردنەوەی نوێژەكان تێ بگەین پێویستە پێناسەیەكی (رخصة) بكەین چونكە كۆكردنەوەش (رخصة)یە، جا (رخصة) هەروەكوزانایانی زانستی (اصول الفقه) بۆیان پێناسە كردوین: بریتی‌یە لەناوێك بۆ شتێك كە خوای گەورە حەلاڵی كردوە لەكاتی پێویستدا وە ئاسان كاریەكە لەسەر خەڵكی و لابردنی ناڕەحەتیە لەسەریان. (الوجيز في أصول الفقه) ص 50 .

كەواتە: (رخصة) بۆ شتێك بەكار دێت خودی خۆی دروست نی‌یە ئەو شتە بكەیت هەتاكو پێویستی (ضرورة)ێك نەیەتە پێشەوە. مەبەستیشمان ئەوەیە كە

پێویسته نوێژ لەکاتی خۆیدا بکرێت وەك خوای گەورە دەفەرموێت:﴿ إِنَّ الصَّلَاةَ كَانَتْ عَلَى الْمُؤْمِنِينَ كِتَابًا مَوْقُوتًا﴾ نساء 103.

بۆیە لای شافعیەکان پێناسەی ئەوەیە ( هو الحكم الثابت على خلاف الدليل لعذر )الاحكام للآمدی 68/1، جابەکورتی (رخصة ) ئەو حوکمەیە کە خوای گەورە دایناوە لەبەر پێویستی بەندەکان . سەیری (اصول الفقه الاسلامی) 110/1 (وهبة الزحيلی ) بکە .

## سێیەم /ئەو کاتانەی کە کۆکردنەوەی نوێژیان تیا دروستە :

وەك وتمان کۆکردنەوەی نوێژ دروستە بۆ موسافر و نیشتەجێ ، ئەوکاتانەش بەپێی حاڵ و شوێنی خەڵکەکە دەگۆڕێت ،ئەویش پەیوەستی ئەکەین بەقورئان وفەرمودەی پێغەمبەرەوە ﷺ لەوانەش:

نەخۆشی / نەخۆشی یەکێکە لەو حاڵەتانەی کەنوێژ تیایدا کۆدەکرێتەوە، جانیتر نەخۆشەکە نیشتەجێ بێت یان (مسافر) ، وەئەگەر نیشتەجێ بو نوێژەکانی چوار چوار دەکات، بەلام ئەگەر (مسافر) بو نوێژەکانی دو ڕکات دو ڕکات دەکات وکۆیان دەکاتەوە، وەئەگەر لەگەڵ جەماعەت نوێژی کرد دوای سەلام دانەوە بۆ خۆی نوێژەکەی تریان دەکات، ، بەلام بەمەرجێك نەخۆش دروستە نوێژەکانی کۆ بکاتەوە کە ئەو نەخۆشە بۆ نوێژەکەی تر کە کۆیدەکاتەوە زۆر لەسەری ناڕەحەت بێت، بۆیە لە(المغنی )دا (ابن قدامة ) دەفەرموێت: (والمرض المبيح للجمع هو مايلحقه تادية كل صلاة في وقتها مشقة وضعف ) واتە: ئەو نەخۆشیەی کە کۆکردنەوەی نوێژ حەلاڵ دەکات ئەوەیە کەبەکردنی هەمو نوێژێك لەکاتەکەی خۆیدا توشی ناڕەحەتی ولاوازی بکات. بڕوانە (فقه السنة ) 291/1 ،و (المغني مع شرح الكبير) 121/2 .

هەروەها شیخ الاسلام دەفەرموێت: کۆکردنەوەی نوێژ دروستە بۆ ئەو دایکەی کە شیر دەدات بە منداڵەکەی، ئەگەر لەسەری قورس بو هەمو نوێژێك پۆشاکەکەی بشوات، ئەمەش دەقی وتەی پێشەوا ئەحمەدی لەسەرە . بڕوانە (الاختیارات الفقهیة) ص 74 .

لەهەمان کاتدا ئەمەش ڕای پێشەوا مالك و قازی حسین و(خطابی)و (متولی)یە لەشافعیەکان بۆ دروستێتی کۆکردنەوەی نوێژ بە(تقدیم) و(تاخیر) لەبەر نەخۆشی چونکە نارەحەتیەك لەباران زیاترە . سەیری (فقه السنة) بکە . هەروەها نەخۆشییەکانی گورچیلە ومیزەچرکە (سلس البول) هەر نەخۆشین ودروستە تیایاندا نوێژەکان کۆبکرێنەوە، چونکە پێغەمبەر ﷺ فەرمانی بە ئافرەتەکە کرد لەبەر ئەزیفی (إستحاضة) نوێژ کۆبکاتەوە فەرمودەکەش (حسن)ە بڕوانە (إرواء الغليل) 38/3 فەرمودەی (580) .

بەلام پێشەوا شافعی ڕای لەسەر ئەوەنیە کە نەخۆشێکی نیشتەجێ کە(مسافر)نە بێت نوێژەکانی کۆبکاتەوە بڕوانە(عون المعبود)56/4فەرمودەی ژمارە (1290)بەلام ئەوەی کە ڕاستر و بەهێزترە ئەوەیە کە دروستە بۆ کەسێك کە نەخۆشە و نەخۆشیەکەی بەو شێوازەیە کەلەسەرەوەباسمان کرد نوێژەکان کۆبکاتەوەجا بە(تقدیم)بێ یان بە(تاخیر)بێت ئەویش بەستراوە بە حاڵی نەخۆشەکەوە بەلگەش لەسەر ئەوەی ئەم ڕایە ڕاستترو بەهێز ترە ئەوەیە کە (إبن عباس) دەفەرموێ: پێغەمبەر ﷺ لەمەدینەدا بو نوێژەکانی نیوەڕۆ و عصرو پاشان مەغریب و عیشای کۆکردەوە بەبێ ئەوەی کە ترسی هەبێت یان باران بێت ...)هەروەکو لە پێشەوەدا ئەم فەرمودەمان هێنا جا ئەگەر پێغەمبەر ﷺ بەبێ ئەوەی کە باران و ترس لە ئارا دابێ نوێژەکانی کۆکردبێتەوە ئەوا زۆر (أولى) ترە کەلەبەر نەخۆشیەك کە خاوەنەکەی نارەحەت بکات کە نوێژەکان لەکاتی خۆیدا بکات کە بۆی دروست بێ نوێژەکانی کۆبکاتەوە...کۆتایی فەرمودەکەی (ابن عباس) یش ئەوەیە کە پرسیاریان لێ کرد بۆ پێغەمبەر ﷺ ئاوای کرد؟ ئەویش

فەرموی: لەبەر ئەوەی ئوممەتەکەی ناڕەحەت نەکات، بێگومان نەخۆشیەکیش کە سیفەتەکەی وابێت وەك لەپێشەوە باسمان کرد خاوەنەکەی توشی ناڕەحەتی دەکات کە هەمو نوێژەکانی لەکاتەکانی خۆیاندا بکات، جابۆیە لەکۆتاییدا دەگەینە ئەو ئەنجامەی کە کۆکردنەوە (رخصة) یە بۆ نەخۆش و خوای گەورەش پێی خۆشە کە (رخصە)کانی بکرێت هەر وەك پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت: (إن الله يحب ان تأتى رخصه كما يكره ان تاتى معصيته) رواه أحمد عن ابن عمر (إرواء الغليل) 9/3 بڕوانە (فتاوى اللجنة الدائمة) 85/8 .

ب. ترس / ترسیش یەکێکە لەو حاڵەتانەی کە کۆکردنەوەی نوێژی تیا دروستە، چونکە (معاذ بن جبل) ﷺ دەفەرموێت: پێغەمبەر ﷺ لە جەنگی تەبوکدا نوێژی نیوەڕۆو عەسری کۆکردەو، هەروەها مەغرب وعیشاشی کۆکردەوە، ڕاویەکە کەلە معازەوە دەگێڕێتەوە دەفەرموێت: وتم بەمعاذ: بۆچی پێغەمبەر ﷺ وای کرد؟ ئەویش فەرموی: بۆ ئەوەی هیچ قورسیەك نەمێنێ لەسەر ئوممەتەکەی. بڕوانە (شرح صحيح مسلم) 807/2 .

هەروەها بەڵگەیەکی تریشمان هەیە لەسەر ئەم باسە، ئەویش فەرمودەکەی (ابن عباس)ە کە هەندێ لەمەو پێش هێنامانەوە وباسمان لێوە کرد،ئەوەشی کە تیایدا هاتبو ئەوەیە کە دەفەرموێت: پێغەمبەر ﷺ نوێژەکانی کۆکردەوە لەمەدینەدا بەبێ بونی ترس وباران، کەواتەئەگەر ترس وباران هەبێت ئەوا زۆر دروستە کە نوێژەکان کۆبکرێنەوە.

ج .دەرچون بۆ سەفەر / واتە: ئەگەر نیشتەجێ بویت ونیەتی سەفەرت هەبو، بۆنمونە: چوار ڕکاتی نیوەڕۆ دەکەیت وچوار ڕکاتی عەسریش دەکەیت، (سەلەمە)ی کوڕی عبداللە ی کوڕی ئیمامی عمر دەفەرموێت: عبداللە ی کوڕی عمرم بینی نوێژەکانی کۆکردەوە کەلەسەفەردا بو، پاشان لای کردوە وفەرموی: لە پێغەمبەرم ﷺ بیستوە کە فەرمویەتی: ئەگەر یەکێکتان ئیشێکی هەبو ئەترسا نوێژەکەی بفەوتێ با ئەم نوێژە بکات، (واتە: کۆیان بکاتەوە) ئەمەش تاکە فەرمودەیەکە

که باسی کۆکردنەوەی تیایە بەفەرمودەی (قەولی) فەرمودەکەش پێشەوا (النسائی) ڕیوایەتی کردوە. بڕوانە (صحیح الجامع الصغیر) ژمارەی فەرمودە (487) و(الثمرات الجیاد).

هەروەها عبدالله ی کوڕی عمر دەفەرموێت: پێغەمبەری خوام بینی ﷺ که نوێژی مەغرب وعیشای کۆکردەوە کاتێك لەسەر ڕێ بو، واتە: لەو شوێنە نەمابوەوو بەتەمای دەرچون بو، بڕوانە (صحیح مسلم) 805/2 . ئەم حوکمەش پیاو ژن تیایدا بەشدارن وەکو چون لە زۆربەی عوزرەکانی تردا بەشدارن، بگرە ئافرەتان زیاتر توشی کۆکردنەوەی نوێژ دێن تەنها لەبارانداا نەبێت کە لەماڵەوەن، بەڵام ئەگەر ئافرەت بیەوێت ئاو بێنێت لەسەر کانی یان ئیشێکی پێویستی هەبێت، دروستە ئەو ئافرەتە نوێژ کۆ بکاتەوە، بۆ زیاتر شارەزا بونیش سەیری فەتواکانی (ابن عثیمین) بکە .

د . ئیش وکاری پێویست / هەروەها ئیش وکاری زۆر پێویستیش عوزرە بۆ کۆکردنەوەی نوێژەکان، وەکو ئیش وکاری ئەو کەسەی لای نەخۆشێکە لەخەستەخانەیەك، یان جێبەجێ کردنی ئیشی موسلمانێك، یان ئیش وکاری شوێنێك کە سەنگەر نشینی تیایدا دەکرێت، وەك ئامادە کردنی تەقەمەنی وسەنگەر هەڵکەندن وئاڵو گۆڕکردنی ئەو کۆمەڵەی کە لەوێن.. بەکورتیەکەی هەرکاتێك بترسیت کە نوێژەکەت دەفەوتێت بەهۆی ئیش وکارێکی پێویستەوە، ئەوا بۆت هەیە لەبەر ئەو جۆرە ئیش وکارە نوێژەکانت کۆ بکەیتەوە، بۆیە (ابن تیمیة) دەفەرموێت: ( وأوسع المذاهب في الجمع: مذهب أحمد، فإنه جوز الجمع إذا كان له شغل كما روى النسائي مرفوعاً الى النبي ﷺ وغيره، نص أحمد على المراد بالشغل الذي يبيح ترك الجمعة والجماعة) واتە: فراوانترین بۆچون لە کۆکردنەوەدا بۆچونی پێشەوا ئەحمەدە، بۆیە لای ئەو دروستە کۆکردنەوەی نوێژ بۆ یەکێ ئەگەر ئیشێکی هەبو وەك (النسائی) ڕیوایەتی کردوە لە پێغەمبەرەوە ﷺ (قاضی أبو یعلی) غەیری ئەو دەفەرمون - مەبەستی پێشەوا ئەحمەد- لەئیش وکاردا ئەو

ئیشەیە کە وادەکات نوێژی جومعە وجەماعەت نەکەیت. بڕوانە ( الفتاوى المصرية ) ص77 . و( الاختيارات الفقهية ) ص74 .

هەروەها شیخ الاسلام دەفەرموێت: ( ويجوز الجمع أيضاً للطباخ والخباز ونحوهما ممن يخشى فساد ماله ) واتە: کۆکردنەوەی نوێژ دروستە بۆ ئەو کەسەی چێشت دەکات ونانەوایە وهاو وێنەیان لەئیش وکارەکاندا کە ئەترسن ماڵەکەیان بفەوتێ وتیا بچێت. ( الاختيارات الفقهية ) ص 74 . بێگومان مەبەستی چێشت لێنەرێکە کە زۆر بەدەگمەن بواری هەبێت، نەك هەمو چێشت لێنەرێك ..

هـ. کۆکردنەوە لەمزدەلفە / زانایان یەکدەنگن لەسەر ئەوە کە دروستە کۆکردنەوەی نوێژی نیوەڕۆ وعەسر بەوەی کە نوێژی عەسر بێنی بۆلای نیوەڕۆ لە( عرفة ) هەروەها کۆکردنەوەی نوێژی مەغرب وعیشا، بەوەی کە نوێژی مەغرب بێنی بۆلای عیشا لەمزدەلفە . سەیری ( فقه السنة ) بکە 289/1 .

شیخ الاسلام دەفەرموێت: ( ويدل على جمع التقديم بعرفة بين الظهر والعصر لمصلحة الوقوف ليصلى وقت الدعاء ويقطع بنزول الصلاة العصر مع إمكان ذلك بلا مشقة والجمع كذلك لأجل المشقة والحاجة أولى .. ) ( زاد المعاد ) 462/1 .

و. باران بارین /باران وبەفر یەکێکە لەو هۆیانەکە نوێژ کۆکردنەوە تیایاندا دروستە، بەو مەرجەی ئەو بارانە ناڕەحەتیەك دروست بکات، ناڕەحەتیش وەك تەڕ بونی جل وبەرگو هاوشێوەکانی، هەروەك ( ابن قدامة ) لە ( المغنى )دا دەفەرموێت: ( والمطر المبيح للجمع هو ما يبل الثياب وتلحق المشقة بالخروج فيه، وأما الطل المطر الخفيف الذى لايبل الثياب فلا يبيح والثلج كالمطر في ذلك، لأنه في معناه وكذلك البرد ) واتە: ئەو بارانەی کە دەبێتە هۆیەك بۆ کۆکردنەوەی نوێژەکان دەبێت بارانێك بێ کە جل وبەرگ تەڕ بکات وناڕەحەتیەك دروست بکات بۆ ئەو کەسەی کە لەماڵ بچێتە دەرەوە، بەلام سەبارەت بە بارانی کەمەوە کە سیفەتەکەی وایە نابێتە هۆی تەڕ کردنی جل وبەرگ بەتەواوی، ئەوا دروست نییە لەکاتی بارانی لەم جۆرەدا کۆکردنەوەی نوێژەکان، وەبەفریش هەروەك باران

وەهایەو تەرزەش هەر بەهەمان شێوە . بڕوانە (المغنى مع شرح الكبير) 119/2 .
بەڵگەش لەسەر ئەم خاڵە فەرمودەکەی عبدالله ی کوڕی عباسە کەلە پێشەوە لەخاڵەکانی (أ .ب) ئاماژەمان بۆ کرد و باسمان لێوە کرد، هەروەها فەرمودەکەی عبدالله یکوڕی عمریش کە بەدو شێوە هاتوە بەڵگەن لەسەر ئەم خاڵە.
شێوەی یەکەم: ابن عمر فەرمانی دەکرد کە بانگ بدرێت بۆ نوێژو بوترێت :نوێژەکانتان لەشوێنەکانی خۆتان بکەن، ئەمەش لەشەوێکی ساردو بارانا ویدا بو لەسەفەردا . (متفق عليه عم ابن عمر) بڕوانە (إرواء الغليل) 339/2 .
شێوەی دوەم: ابن عمر ئەگەر لەکاتی باراندا ئەمیرەکان نوێژی مەغرب وعیشایان کۆبکردایەتەوە ئەمیش کۆیدەکردەوە لەگەڵیاندا.. ) رواه الإمام مالك بڕوانە (إرواء الغليل) 41/3 .
سەبارەت بەبۆچونی زانایان لەبارەی کۆکردنەوە لەباراندا پێشەوا (خطابی) دەفەرموێت: زانایان جیاوازیان لەنێواندا هەیە لەسەر کۆکردنەوەی نوێژ لەکاتی باران بارینداا بۆ کەسێك کە نیشتەجێیەو (مسافر) نیە، جا هەندێ لە پێشینان ڕێیان پێداوە، - واتە دەڵێن دروستە- ئەمەش لە ابن عمرەوە ڕیوایەت کراوە وعوروەی کوڕی زبیرو سەعیدی کوڕی مسیبب و عومەری کوڕی عبدالعزیز وابوبکری کوڕی عبدالرحمن وابو سەلەمەو تەواوی زانایانی (فقه) کردویانە، بۆچونی پێشەوا مالك وشافعی وئەحمەدیش هەر لەسەر ئەمەیە، بەڵام لای پێشەوا شافعی ئەوە بەمەرج گیراوە کە دەبێت لەکاتی دەست پێ کردنی نوێژەکەدا باران بارین بونی هەبێت وببارێت، هەروەها پێشەوا (ابوثور)یش بۆچونی وەك پێشەوا شافعی وایە، بەڵام باقی زانایانی تر ئەو مەرجەیان بەمەرج نەگرتوە کە هەردو پێشەوا (شافعی)و( ثوري)بەمەرجیان گرتوە ،وە پێشەوا (مالیك)یش پێی وایە کە دەبێت لەگەڵ بارانەکەشدا قوڕو تاریکی بونی هەبێت.ئەمەش وتەی (عمر)ی کوڕی (عبدالعزیز)ە پێشەوا (ئەوزاعی) و حنەفیە کانیش دەفەرمون :لە کاتی باراندا موسڵمان نوێژەکانی هەرلە کاتی خۆیدا دەکات .أھ بڕوانە (عون

المعبود )4/55-56.

بەلام سەبارەت بەو کەسەی کەدێت بۆ مزگەوت و تووشی نارەحەتی نایەت لە کاتی هاتنیدا بۆ مزگەوت بۆ نمونە بە سەیارە دێت یان چەتری پێیە یان بە هەرشێوەیەکی تر کە باران لێی نادات ،هەروەها سەبارەت بەو کەسەشەوە کە ماڵی لە مزگەوت دایە جا دەربارەی ئەم حاڵەتانە پێشەوا (إبن قدامة) دەفەرموێت:دوبۆچونی لەسەرە ،یەکەمیان دەڵێت لەهەمو ئەو حاڵەتانە دروستە (جمع)بکرێت،چونکە ئەگەرئەم حاڵەتەی هاتە پێشەوە بۆ هەمو خەڵکی ،ئەوا ئەو کەسانەش دەگرێتەوە ئەو عوزرە یان ئەو پێویستیەیان نیە وەکو زۆرێك لەخەڵکی ،بەڵگەش لەسەر ئەمە ئەوەیە کە ڕیوایەت کراوە،لە پێغەمبەرەوە ﷺ کە (جمع)ی کردوە لە کاتی باراندا و لە نێوان شوێنەکەی و مزگەوتداهیچ بەین و ماوەیەك نەبوە،بۆ چونی دوەمیش دەڵێت:(جمع)تایبەتە بەوانەوە کە نارەحەتی ڕو بەڕویان دەبێتەوە ..)بڕوانە (المغنی مع شرح الکبیر)2/120.

بەلام سەبارەت بەو کەسەوە کە لە ماڵەوە یەو نایەت بۆ مزگەوت لە کاتی باراندا ئەوا بۆی دروست نیە (جمع) بکات،لەم بارەیشەوە فەتوایەکی لیژنەی فەتوای سعودی هەیەبەم شێوەیە:

فەتوای ژمارە (4554)پرسیارەکە :حوکمی (جمع)کردن چییە لەماڵەوە لەکاتی ڕۆژانی سەرماو باران ،ئەگەر بێت و ئێمە و کۆمەڵێ بوین لە ماڵەوە ئەوەی کە ئێمە ،زانیومانە ،ئەوەیە کە ،(جمع)لە مزگەوتدا دەکرێت ئەوەکو لە ماڵەوە ؟،

وەلام ئەوەی کەشەرعی دروست بێ ،ئەوەی خەڵکی مزگەوت (جمع) بکەن ئەگەر ببێت و عوزرێکی شەرعی هاتە پێشەوە وەکو باران ،ئەمەش لە پێناوی دەست کەوتنی پاداشتی جەماعەت و ئاسان کردنی لەسەر خەڵکی وەفەرمودەی (صحیح)یشی لەسەرە هەر بەم شێوەیە هاتوە، بەلام سەرەبارەت بە (جمع)کردنی کۆمەڵێك لە ماڵەوە،لەبەر بونی ئەو عوزرەی کەلە پرسیارە کەدا باسکراوەدروست نیە ،چونکە ئەوە شێوازی ئاوا لە شەرعی بێگەردی ئیسلامدانەهاتوە، وەئەوشێوازە

عوزر نیه بۆدروست بونی ( جمع )وبالله التوفیق....فتاوی اللجنة الدائمة134/8.

له کۆتایی ئەم خاڵەدا ئەوەی کەوا ماوە ،تیشکی بخەینە سەر و باسی لێوە بکەین ئەوەیە که ئەگەر بێت وشوێنێك عەسکەری بێت و ئەمیری ئەو شوێنە نوێژی کۆنەکردەوە،ئەوا بۆ کەس نیە سەر بەخۆ نوێژ کۆبکاتەوە ،چونکە ،جیهاد و ( أمارة )دوشتن زۆر بە یەکەوە گونجاون و پێویستە لەسەر جەماعەی جیهادی کەس ئیجتهادی سەر بەخۆ نەکات.

ز/بونی قوڕ:

سەبارەت بە بونی قوڕ بەتەنها بونی باران و سەرما ی لەگەڵدا بێت پێشەوا ( إبن قدامة )له کتابی ( المغنی )دا دەفەرموێ( فأما الوحل بمجرده،فقال القاضي :قال أصحابنا هو عذر لأن المشقة تلحق بذلك،في النعال والثياب ،كما تلحق بالمطر وهو قول مالك،وذكر أبو الخطاب ،فيه وجها ثانياً إنه لايبيح وهو مذهب الشافعي وأبي ثور لأن المشقة دون مشقة المطر ،فان المطر يبل النعال والثياب والوحل لا يبلها فلم يصح قياسه عليه والأول أصح لأن الوحل يلوث الثياب والنعال ومتعرض الإنسان للزلق فيتأذى نفسة وثيابه وذلك أعظم من البلل..) (المغني مع الشرح الكبير)119/2.

واتە :بەلام سەبارەت بە قوڕ بەتەنها ( قاضي أبو يعلى )دەفەرموێت : هاوەلا نمان دەفەرمون واتە،لە حنبەلیەکان - ەوە قوڕیش عوزرە بۆ کۆکردنەوە ی نوێژ چونکە پێلاو جل وبەرگی ئینسان توشی ناڕەحەتی دێن هەروەکو چۆن بەهۆی بارانەوە توشی نارەحەتی دەبێت،ئەم بۆ چونەش لە هەمان کاتدا بۆ چون و وتەی پێشەوا ( مالیك )ەو زانا ( أبو الخطاب )یش ڕایەکی تری باس کردوە دەربارەی کۆکردنەوە بەهۆی قوڕەوە،ئەویش ئەوەیە کە دروست نیە بەهۆی قوڕەوە کۆکردنەوەی نوێژ کردن ئەمەش بۆچونی پێشەوا ( الشافعی )و ( ابو ثور )ە چونکە ئەو نارەحەتیەی کە ڕوبەڕوی ئینسان دەبێتەوە،وە بەهۆی قوڕەوە کەمترە لەو نارەحەتیەی کەبەهۆی بارانەوە توشی دەبێ چونکە باران دەبێتە هۆی تەڕکردنی جل و بەرگ و پێلاو،

بەلام قوڕ نابێتە هۆی تەڕ کردنیان لەبەر ئەوەی ڕاست و دروست نیە ،کە قوڕ وەکو باران سەیر بکرێت ،وەقیاسی بکرێتە سەر (إبن قدامة ) دەفەرموێت:بەلام وتەی یەکەم ـ باسمان کرد،ڕاست تر و بەهێز ترە چونکە قوڕ دەبێتە هۆی پیس کردنی پێلاو و جل و بەرگ وە ئینسان تیایدا لە مەترسیدایە بۆ کەوتن کە ئەمەش دەبێتە هۆی نارەحەت کردنی ئینسان وپیس بونی جل و بەرگەکەی جا ئەمانەش نارحەتیەکەشیان زیاترو گەورە ترە لە تەڕبون ..بەڵگەش ئەوەیە کە (عبدالله )کوڕی عباس ڕۆژی جمعە فەرموی : (قال للمؤذن في يوم مطير إذا قلت :أشهد أن لا إله إلا الله ،أشهد أن محمداً رسول الله فلا تقل حي على الصلاة ، قل صلوا في بيوتكم قال:فكأن الناس إستنكروا ذلك فقال:أتعجبون من ذلك فقد فعل من هو خير مني ،أن الجمعة عزمة واني كرهت أن أخرجكم فتمشوا في الطين والدحض)واتە :عبد الله ی کوڕی عباس لە ڕۆژێکی باراناویدا فەرموی :بەبانگ دەرەکە ئەگەر وتت (أشهد أن لا إله إلا الله أشهد أن محمدا رسول الله )مەڵێ : (حي على الصلاة )بڵێ (صلوافي بيوتكم )واتە : فوێژە لە ماڵکانتان بکەن ،وەك بڵێی خەڵکی بەلا یانەوە سەیر بو ،فەرموی :بەلاتانەوە سەیرە کەسێك وای کردوە کە لە من باشترە واتە ( پێغەمبەر ﷺ ) نوێژی جمعە واجبە بەلام حەزم نەکرد لە ناو قوڕو چلپاودا بێن بۆنوێژ(مسلم) ریوایەتی کردوە،(شرح مسلم)800/2(فتح الباري)43/3،جا ئەگەر بەڕۆژ نوێژی جمعە دروست نبێ نەکرێت لە بەر باران و قوڕ ئەوا ئەولا ترە کەوا لەبەر قوڕی زۆر نوێژ کۆبکرێتەوە،بەتایبەتی شەوان.

ی ـ بای توند

دەربارەی بای توندیش لە شەوێکی تاریکی سارددا (إبن قدامة ) دەفەرموێت:دو بۆ چونی لە سەرە ـ واتە:لای حەنبەلیەکان ـ پێی وایە کە کۆکردنەوە تیایدا دروستە ،زانا (الآمدي)یش دەفەرموێ:ئەم ڕایە ڕاسترە وئەمەش وتەی عمری کوڕی عبدالعزیزە چونکە ئەم حاڵەتە عوزرە بۆ نەهاتن بۆ نوێژی (جمعە ) ە جەماعەت،بەبەڵگەی ئەم ڕیوایەتەی کە ڕیوایەت کراوە لە (إبن عمر)ەوە

دەفەرموێت: پێغەمبەری خوا ﷺ بانگ دەرەکەی لە شەوێکی باراناویدا یان لە شەوێکی سارد بای هەبودەیفەرمو :نوێژەکانتان لە شوێنەکانی خۆتان بکەن..(إبن ماجه )روایەتی کردوه لە ( محمد بن صباح )ەوە سەبارەت بە بۆ چونی دوەمیشەوە پێی وایە کەئەم حاڵەتە ـ واتە بونی بای توند لە شەوێکی سارددا نابێتە هۆیەك بۆ کۆکردنەوەی نوێژەکان چونکە ئەو نارەحەتیەی کە ئینسان بە هۆی بایەکی ئاواوە توشی دەبێت ،کەمترە لەو نارەحەتیەی کە ئنسان بەهۆی باران بارینەوە توشی دێت ،جا لەبەر ئەوە ڕاست و دروست نیە قیاسی ئەوە بکرێتە سەر بای توند..بڕوانە(المغنیمع الشرح الکبیر)2/119ـ 120.سەیری بخاری بکە ،بەلام ڕاستر وایە کە نوێژ کۆ دەکرێتەوە لە کاتی بای توند بەتایبەتی ئەگەر سەرمای لەگەڵدابو، پێشەوا( مسلم ) ڕیوایەتی دەکات لە عبدالله ی کوڕی عمر ڕەزای خویان لێبێ : ( إن ابن عمر أذن بالصلاة في ليلة ذات برد وريح فقال :الا صلوا في رالرحال ثم قال :كان رسول الله ﷺ يامر المؤذن إذا كانت ليلة باردة ذات مطر يقول :الاصلوا في الرحال )واتە: بانگی دا بەنوێژ کردن لە شەوێکی ساردو سەرمادا فەرموێ ( لەشوێنەکانتان نوێژ بکەن )پاشان فەرموی پێغەمبەر ﷺ فەرمانی کرد بە نوێژ کەر لە شەوێکی ساردو بادا ئەی فەرمو: لە شوێنەکانتان نوێژ بکەن،( مسلم )ڕوایەتی کردوە2/799.

ئاشکراشە ئەو عوزرەی وا بکات کە ئەچی بۆ جەماعەت هەمان عوزرە بۆ کۆکردنەوەی نوێژ سەیری (إختيارات الفقهي)بکە74،هەروەها (الفتاوى المصرية )77.

## چوارەم/ کۆکردنەوەی نوێژ بۆ نیشتەجێ ( المقيم )بەبێ عوزر:

جەماوەری زانایان لەسەر ئەوەن کە نیشتە جێ بۆی نیە نوێژ کۆبکاتەوە،ئەگەر هیچ عوزرێکی نەبو، پێشەوا شەوکانی دەفەرموێت: ( وذهب الجمهور الى أن الجمع

لغير عذر لا يجوز وحكى في البحر عن البعض أنه إجماع )واته :جەماوەری زانایان لەسەر ئەوەن کەوا نیشتە جێ بۆی نیە نوێژ کۆبکاتەوەبەبێ عوزر،وە خاوەنی کتێبی ( البحر )دەگێرێتەوە لە هەندێك لە زانایان کەوا کۆڕان لەسەر ئەوە .(نیل الأوطار)/229.

ئەو فەرمودانەش لەسەر ئەوە هاتون( متواتر )ن وله کتێبی( العدة شرح العمدة )دا دەفەرموێ ( وقد أجمعنا أن الجمع لغير عذر لا يجوز)100/1.واتە :کۆڕاین لەسەر ئەوەی کە کۆ کردنەوە بەبێ عوزر دروست نیە ، پێشەوا (بیهقی )لە عمری کوڕی خەتتابەوە ڕیوایەتی کردوە کە دەیفەرمو:کۆکردنەوە لە نێوان دو نوێژدا بەبێ عوزر گوناهێکە لە گوناهە گەورەکان ) سەیری ( مجموعة الفتاوى )24 / 28بکە، هەروەها ( الثمرات الجياد ) ص162/4.

بەلام ئەو (إشكال )ەی کە دروست بوە لە لای هەندێ کەس کەگوایە بەبێ عوزر سنەتە کۆکردنەوە ،ئەوا بەڕاستی پێچەوانەی (إجماع )کۆڕای زانایانە، پاشان نەهاتوە کە بەبێ عوزر پێغەمبەر ﷺ نوێژی کردبێت،فەرمودەکەی( إبن عباس ) یش کە دەفەرموێ ( جمع رسول الله ﷺ بين الظهر والعصر والمغرب والعشاء بالمدينة من غير خوف ولا مطر ،وفي رواية من غير خوف ولا سفر )پێشەوا (مسلم )ڕوایەتی کردون ،واتە :پێغەمبەر ﷺ نیوە ڕۆو عەسری کۆکردەوە هەروەها مغریب وعیشای کۆکردەوە لە مەدینەدا بەبێ ترس و باران ،لە ڕیوایەتە کەی تردا بەبێ بونی ترس و سەفەر.

ئەم فەرمودەیە بەلگەیە کە بە عوزر نوێژەکانی کۆکردوەتەوە بۆیە ( شيخ الإسلام ) دەفەرموێ : (فإن الكلام يدل على أن الجمع لهذه الأمور أولى )واتە :ئەمە بەلگەیە کە کۆکردنەوەی نوێژ بۆ ئەم شتانە شایەن ترە،هەروەها ئەفەرموێ : ( فإنه جمع ليرفع الحرج الحاصل بدون الخوف والمطروالسفر)واتە :پێغەمبەر ﷺ نوێژی کۆکردۆتەوە بۆ ئەوەی نارەحەتیەك کە دروست دەبێ کە ترسی تیا نیە و سەفەر نیە، لەغەیری ئەمانە نوێژ کۆبکرێتەوە،هەروەها (عبدالله ی کوری عباس ئەو

خەڵکە فێر دەکات بە عەمەلی وەك (إبن تيمية) دەفەرموێت: (ولكن كان إبن عباس في أمر مهم من أمور المسلمين يخطبهم فيما يحتاجون الى معرفته) واتە :إبن عباس لەکارێکی زۆر گرنگ لە کارو باری موسڵمانان وتاریان بۆ دەدات لەوەی کە پێویستیانە بیزانن،هەروەها (ابن تيمية)دەفەرموێ: (فإن النبي ﷺ يجمع بالمدينة لغير خوف ولا مطر بل لحاجة تعرض كما قال: أراد أن لا يحرج أمته) واتە : پێغەمبەر ﷺ لەمەدینە نیشتەجێ بو، نوێژی کۆکردەوە بەبێ ترس وباران ،بەڵکو لەبەر پێویستیەك کە دێتە پێشەوە، وەك (إبن عباس) دەفەرموێ ویستی - واتە پێغەمبەر ﷺ - کەس لە ئۆممەتەکەی تووشی نارەحەتی نەبێ ،هەروەها (إبن تيمية)دەفەرموێ: (فهكذا جمعه بالمدينة الذي رواه إبن عباس وإنما كان الجمع لرفع الحرج عن أمته فإذا إحتاجوا الى الجمع جمعوا) واتە :کۆکردنەوەی نوێژی پێغەمبەر ﷺ لەمەدینەدا کە عبدالله ی کوری عباس دەگێڕێتەوە ،کۆکردنەوەکە بۆ لابردنی نارەحەتی بو لەسەر ئۆممەتەکەی ،جا ئەگەر پێویستی هاتە پێشەوە نوێژ کۆئەکرێتەوە.(مجموعة الفتاوى)24/46-47.

کەواتە فەرمودەکە بەڵگە نیە کە بێ عوزر نوێژکۆبکرێتەوە،بەتایبەتی کە هەندێ کەس فەرمودەکە دەگێڕنەوە یەکسەر ئەڵێن:بەبێ عوزر کردویەتی ،بگرە هەندێك ئەڵێن: (من غير خوف ولا عذر) لەکاتێکدا زیادەی عوزر هیچ ریوایەتێکی (صحيح)و(ضعيف)و نە(موضوع)نەهاتوە،لەگەڵ ئەوەشدا پێچەوانەی جەماوەری زانایانە.وە ئەم درێژکردنەوەیەش لەم خاڵەدا لەبەر ڕەوینەوەی ئەو تێگەیشتنە هەڵەیەبو کە زۆرێك خەڵکی وای لێ حاڵ بون،وە پێش ئەوەش کۆتایی بەم خاڵە بێنم ریوایەتێك هەیە لەم باسەداو پێشەوا (الذهبي) دەیگێڕێتەوە کە دەفەرموێ: (هۆی دەرچونی زاناکان لە عیراق دژی (حجاج) لەبەر ستەم و دواخستنی نوێژ و کۆکردنەوەی نوێژ بولە نیشتە جێیدا ..بڕوانە (القول المبين)ص412،و(سيرأعلام النبلاء)1/158.

## پێنجەم/( جمع )لەسەفەردا :

## کۆکردنەوەی نوێژ لەسەفەردا بەبێ عوزر:

( شيخ الإسلام )دەفەرموێ: (وأما النازل أياماً في قرية أومصر وهو في ذلك كأهل المصر ،فهذا وإن كان يقصر لأنه مسافر فلايجمع كما لايصلى على الراحلة ولا يصلى بالتيمم ولا يأكل الميتة فهذه أمور أبيحت للحاجة به الى ذلك بخلاف القصرفإنه سنة السفر ) ( مجموعة الرسائل والمسائل )2 65.

واتە :بەلاّم ئەوکەسەی کەلەسەفەرەکەیدا دەمێنێتەوە چەند ڕۆژێك لە دێیەك یان شاریکدا، لەم حاڵەتە دا حوکمی وەکو خەڵکی شارەکەوایە،ئەمە ئەگەر چی نوێژ کورت دەکاتەوە ،بەلاّم نوێژ کۆ ناکاتەوە،هەروەك چۆن نوێژ لەسەر وڵاخەکەی ناکات

وە بەتەیەمم نوێژ ناکات وە مردارەوەبو ناخوات ،ئەم حاڵەتانە، حەلاڵ کراون بۆ پێویستی ،وە ئەمەش پێویست نیە بەوانەوە،بە پێچەوانەی نوێژ کورت کردنەوە ئەوەیان سوننەتی( مسافر)ە.

هەروەها (إبن قيم )دەفەرموێ: (ولم يكن من هديه ﷺ الجمع راكباً في السفركما يفعله كثير من الناس ولا الجمع حال نزوله أيضاً ،وإنما كان يجمع إذا جد به السير وإذا سار عقيب الصلاة كما ذكرنافي قصة تبوك،وأما جمعه وهونازل غير مسافر فلم ينقل ذلك عنه إلابعرفة لأجل إتصال الوقوف كما قال الشافعي رحمه الله وشيخنا.. )واتە :هەرگیز پێغەمبەر ﷺ سوننەتی وانەبوە لەسەفەر نوێژ کۆبکاتەوە وەك زۆرینەی خەڵکی دەیکات وە نوێژی کۆنەکردوەتەوە لەسەفەردا ئەگەر بمایەتەوە، بەڵکو نوێژی کۆدەکردەوە لەسەفەر دا ئەگەر لە ڕۆیشتندا بوایە وەك لە باسی غەزای تەبوك دا باسمان کرد،بەلاّم کۆکردنەوەی نوێژی پێغەمبەرﷺ لەسەفەردا نەمابێتەوە ڕیوایەت نەکراوە،تەنها لەعەرەفە نەبێت،ئەویش بۆ بەردەوامی وەستان و دوعا کردن بوە،وەك پێشەوا (شافعی) دەفەرموێت

وەپێشەوامان واتە : ابن تيميه (زاد المعاد )63/1 .

هەروەها (إبن تيمية )دەفەرموێ( وأما الجمع فإنما كان يجمع في بعض الأحيان إذا جد به السير وكان له عذر شرعي كما جمع بعرفة ومزدلفة ،وكان يجمع في غزوة تبوك أحياناً ) واتە :بەلاّم کۆکردنەوەی پێغەمبەر ﷺ بۆنوێژەکان ،لەهەندێ شوێندا نوێژی کۆدەکردەوە لە کاتی ڕۆیشتندا ،یان عوزرێکی شەرعی هەبوایە،وەك کۆکردنەوەی لە عەرەفەو موزدەلیفە،هەروەها لە غەزای تەبوك جار جار نوێژی کۆدەکردەوە، هەروەها دەفەرموێ : (وأما الجمع فإنه رخصة عارضة ومن سوى من العامة بين القصر والجمع فهو جاهل بسنة رسول ﷺ وبأقوال علماء المسلمين ،فإن سنة رسول الله ﷺ فرقت بينهما والعلماء إتفقوا على أن أحدهما سنة وإختلفوا في وجوبه وتنازعوا في جواز الآخر فأين هذا من هذا )واتە :کورت کردنەوەی نوێژ وەك کۆکردنەوە نیە،بەلّکو کورت کردنەوە سوننەتێکی بەردەوامە،بەلاّم کۆکردنەوە مۆڵەتێکی کاتیە وەهەرکەسێك هەردوکیان بەیەك حوکم بزانێ ئەوە نەزانە بە سونەتی پێغەمبەر ﷺ و بەوتەی زانایانی ئیسلام چونکە سوننەتی پێغەمبەر ﷺ هەردوکیانی لەیەك جیا کردوەتەوە ،زانایانیش یەك دەنگن کەوا یەکێکیان ـواتە کورت کردنەوە ـ سونەتەوجیاوازیان هەیە لە واجب بونیدا وە جیاوازیان هەیە لە کە کامیان دروستە ـ واتە کۆکردنەوە ـ جا ئەمە لە کوێ و ئەوە لە کوێ: (مجموعة الفتاوى)20/44.

کەواتە هەتاکو عوزرێکی شەرعی نەبێت دروست نیە نوێژ لەسەفەردا کۆ بکرێتەوە،هەمو ژیانی پێغەمبەر ﷺ نەبوە کۆکردنەوەی نوێژ لە سەفەردا بەبێ عوزر وە ئەو فەرمودانەی خەلّکی دەیانکاتە بەلّگە بۆ ئەم مەبەستە لە ڕاستیدا ئەمانە بەلّگە نین بۆ کۆکردنەوە،یان غەزای تبوکە کەئەوە غەزایە یان موزدەلیفەیە ئەوەشیان مەوسیمی حەجەو بۆ لابردنی ئارەحەتیە،سەیری ( مجموعة الفتاوى)20/24ـ25، وە (زاد المعاد )463/1،بکە

حەقیش بەبەلّگەی بەهێزە نەك بەڕیز کردنی وتەی زانایان پێغەمبەریش ﷺ

دەفەرموێ( صلوا كمارأيتموني أصلي )واتە: بەو شێوەیە نوێژ بکەن کەمن کردومە،ئەوەش ژیانی پێغەمبەر ﷺ ڕون و ئاشکرایە کەوا کۆکردنەوە لەسەفەر بەبێ عوزر نەبوە،وە بۆ شارەزا بون لەم خاڵە بگەڕێوە سەر ئەم سەرچاوانەی کەوا لە پێشەوەدا ئاماژەم پێکردن.

## شەشەم/ئەگەر کەسێك نوێژی کۆکردبێتەوە و پاشان جەماعەت بکرێت:

ئەم خاڵە زۆر جار دەبینین کە قامەت دەکرێت لەدواوە دەنگەدەنگ و جۆرە تەشویشێك دەبیستین لەلایەن هەندێك موسڵمان کەنایەن بۆ ریزی جەماعەت ، بەبەڵگەی ئەوەی کە گوایە نوێژیان کۆکردوەتەوە،بەڵام لەڕاستیدا سوننەت وەها نیە،بەڵگەی سوننەت وەهایە ئەو جۆرە کەسانە بەنیەتی نوێژی سوننەت لەگەل جەماعەتدا نوێژەکەیان بکەنەوە،ئەگەرچی نوێژیشیان کۆ کردبێتەوە لەماڵەوەبێت یان لەهەرشوێنێکی تر.،

پێشەوا أحمد دەگێرێتەوە کە پیاوێك لە بەنی( هذيل )وتی:نوێژی نیوەڕۆم لەماڵەوە کرد، پاشان چومە دەرەوە لەبەر حوشترەکانم کە بیدەم بە شوانێك تێپەڕیم بەلای پێغەمبەر ﷺ و نوێژم لەگەڵیدا نەکرد کە نوێژی نیوەڕۆی بۆ خەڵکی دەکرد،کاتێك کە حوشترەکانم دابەشوانەکە،گەڕامەوە ،ئەوەیان بۆ پێغەمبەر ﷺ گێڕایەوە ئەویش پێی فەرموم : ( مامنعك يا فلان أن تصلى معنا حين مررت بنا، قال :قلت:يارسول الله ﷺ اني قد صليت في بيتي قال:و إن ) پێغەمبەر ﷺ فەرموی: فلانەکەس چی وای لێکردی کەنو.
ێژمان لەگەڵدا بکەی کاتێك بەلاماندا تێپەڕی؟ وتی:ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ من لەماڵەوەنوێژم کردبو.فەرموی:ئەگەر نوێژیشت کردبێت.فەرمودەکەش ( حسن )ەبڕوانە ( المسند الصحيح )426/2.هەروەها پێشەوا ( أحمد ) دەگێڕێتەوە لە (یزید)ی کوڕی (أسود ) کە لەگەڵ پێغەمبەردا ﷺ نوێژی بەیانی کرد،کاتێ

پێغەمبەرﷺ نوێژەکەی تەواو کرد دوپیاو نوێژیان نەکرد، پێغەمبەریش ﷺ هەردوکیانی بانگ کردو هەر دوکیانیان هێنا ،ئەوانیش لەترسان گیانیان دەلەرزی پێغەمبەر ﷺ پێیانی فەرموو:چی وای لێکردن کەوا نوێژمان لەگەڵدا بکەن ؟ئەوانیش وتیان: لە شوێنەکانی خۆمان نوێژمان کردوە، پێغەمبەریش ﷺ فەرمووی: وامەکەن. ( فلا تفعلا اذا صليتما في رحالكما ثم أدركتم الإمام ولم يصل فصلا معه فإنه لكما نافلة ) واتە:ئەگەر نوێژتان لە شوێنەکانی خۆتان کردبو،دوایی فریای نوێژی ئیمام کەوتن نوێژبکەن لە گەڵیا ،بۆتان بەسوننەت دەنوسرێت ) رواه أحمد والترمذي وأبو داود والنسائي وابن حبان ،بڕوانە(سبل السلام )36/2،فەرمودەی ژمارە 428 ).

کەواتە نوێژە فەرزەکە دوبارە ناکاتەوە بەڵکو بەنیەتی سوننەت نوێژەکە دەکات لەگەڵ جەماعەتدا،هەروەك چۆن لەسەفەر گەڕایەوە ،کاتی نوێژەکەی مابو کەلەسەفەرەکەیدا بە( تقديم )کۆی کردۆتەوە ،یان عیشای کۆکردۆتەوە،لەبەر باران و دوایی لە کاتی عیشادا باران نامێنێ یان نیوەڕۆ نەخۆشەو بۆ عصر چاك دەبێتەوە،لەهەمو ئەم حاڵەتانەدا نوێژە فەرزەکەی دوبارە ناکاتەوە کە بە( جمع )کردویەتی لەبەر عوزرێك بەڵام لگەڵ جەماعەتدا نوێژەکە دەکات کە کۆی کردبۆوە بە نیەتی سونەت .( فقه السنة )292/1.بکە.

کەواتە : کردنی جەماعەت بە نیەتی سوننەت پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم وەکو سوننەتێك فەرمانی پێ کردوە،بەڵام دوبارە کردنەوەی نوێژی فەرز دروست نیە،چونکە پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ ( لاتعاد الصلاة مرتين ) واتە: نوێژی فەرز دوجار دوبارە ناکرێتەوە، رواه أبو داود والنسائي ) سەیری ( مجموعة الفتاوى ) بکە.149/23.وە (المدونة الكبرى)78.0/1(تەنیا نوێژی جەنازە بۆت هەیە دوبارەی بکەیتەوە: بڕوانە (صحيح البخاري). سەیر (مشكاة المصابيح 362/1-364 باب من صلى صلاة مرتين )

# حەوتەم/ نوێژی نیوەڕۆ بەدوای عصرەوە یان بە پێچەوانەوە:

لە فەرمودەی (صحیح) دا هاتوە ،وەك فەرمودەكەی (معاذ)ی كوڕی جبل .كە لەگەڵ پێغەمبەر ﷺ نوێژی عیشای‌كردوە پاشان دەگەڕایەوە بۆ قەومەكەی دەبوە ئیمام ئەم سوننەتی دەكردو خەڵكەكەش بەدوایەوە فەرزی دەكرد،هەروەها پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت: ( یكون بعدي أمراء یؤخرون الصلاة عن وقتها فصلوا الصلاة لوقتها ثم اجعلوا صلاتكم معهم نافلة )واتە: دوای من چەند ئەمیرێك پەیدا دەبن كە نوێژ دوا دەخەن لەكاتەكەی خۆیدا جا ئێوە نوێژەكە بكەن لە كاتی خۆیدا ، پاشان لەگەڵ ئەواندا نوێژەكانتان وەكو سوننەت بكەن. پێشەوا (مسلم) ریوایەتی كردوە.

هەروەها ئەو فەرمودانەی كەلە خاڵی پێشەوەدا باسمان كردن بەڵگەن بۆ ئەمانە لێرەشەوە دەگەینە ئەوەی كە جیاوازی نیەت دروستە لەگەڵ ئیمامدا ،وە فەرمودەی (إنما جعل الإمام لیؤتم به فلا تختلفوا علیه ) واتاكەی بەم شێوەیە : ئیمام بۆیە دانراوە كەوا شوێنی بكەون و جیاوازی لەگەڵدا دروست مەكەن پێشەوا بخاری ریوایەتی كردوە ئەم فەرمودەیەش بەڵگە نیە كە دروست نی‌یەجیاوازی نیەت نەبێت لەبەر ئەو فەرمودانەی كەباسمان كرد.بەڵكو مەبەستی فەرمودەكە ئەوەیە كە (شیخ الإسلام) دەفەرموێت: (والإختلاف المراد به الإختلاف في الأفعال كما جاء به مفسراً والا فیجوز للمأموم أن یعید للصلاة فیكون متنفلاً خلف المفترض كما هو قول جماهیر العلماء )واتە: ئەو جیاوازیەی كە لە فەرمودەكەدا هاتوە ،مەبەستی لە جیاوازی لەكارەكان(الأفعال)ی نوێژداوەك بەڕونی هاتوە،چونكە دروستە نوێژی سوننەت بكات بەدوای كەسێكەوە كە نوێژی فەرز دەكات ئەمەش وتەی جەماوەری زانایانە.هەروەها (ابن تیمیة )دەفەرموێ : (فقد ثبت صلاة المتنفل خلف المفترض في عدة أحادیث) (مجموعة الفتاوى)217/23.وثبت أیضاً بالعكس ،فعلم ان

موافقة الإمام في نية الفرض أو النفل ليس بواجبة ،والإمام ضامن وان كان متنفلاً ومن هذا الباب صلاة العشاء الأخيرة خلف من يصلي قيام رمضان يصلي خلفه ركعتين ثم يقوم فيصلى ركعتين ،فاظهر الأقوال جواز هذا كله...) (مجموعة الفتاوى) 218/23.واته:كەوابو دروستە کەسێك نوێژی سوننەت بەدوای ئیمامێکەوە کە نوێژی فەرز بکات ،ئەمەش لەچەند فەرمودەیەك دا هاتوە و (ثابت)ە هەروەها بە پێچەوانەوە فەرمودەی لەسەرە بەم شێوەیە ڕون دەبێتەوەو دەزانرێ هاوتا بونی ئیمام لەنیەتی نوێژی فەرزیان سونەت دا واجب نیە ،ئیمامیش زامنە ئەگەرچی سوننەت بکات هەرلەم باسەشە نوێژی عیشا بەدوای کەسێکەوە کە تەروایح دەکات و دوای ئەوان دو رکاتە کە تەواو دەکات ،ڕونترین وتەی زانایان ئەوەیە کەوا هەموی دروستە ،ئەمەش بۆ چونی پێشەوا (شافعی) و (أحمد)ە لەوتەیەکیدا،سەیری(مجموعة الفتاوى)219/23بکە.

پێشەوا (إبن قدامة)لە(المغنى)دا دەفەرموێ : (فصل:فإن صلى الظهر خاف من يصلى العصر ففيه أيضاً روايتان ،نقل إسماعيل بن سعد جوازه ،ونقل غيره المنع..) واتە : ئەگەر کەسێك نوێژی نیوەڕۆی بەدوای کەسێکەوە کرد کە نوێژی عصری دەکرد ئەوا لەڕێڕەوی پێشەوا أحمد دا دو ریوایەتی لەسەرە ئسماعیلی کوڕی سعد ئەقلی کردوە کە جائیزە ، غەیری ئەمیش ئەقلی ئەمەیان کردوە کە ئەم حاڵەتە ئابێت و دروست نیە ..بڕوانە (المغنى مع الشرح الكبير)54-53/2

وە هەر لەم بارەشەوە لیژنەی فەتوای سعودی فەتوایەکی هەیە،فەتوای ژمارە (3498) کورتەی پرسیارەکەی ئەوەیەکە کەسێك هاتوە بۆ (حرم)بۆ (طواف)و نوێژی نیوەڕۆی دوا خستوە بۆلای عەسر،وە کاتێك هاتوەتە ژورەوە،بۆ (حرم)بۆ (طواف) کاتی نوێژی عەسر هاتوە و قامەتیان کردوە بۆ نوێژی عەسر ،ئەمیش بواری نەبوە بڕوانە دەرەوە و خۆی تەنیا نوێژەکەی بە(قسروجمع)بکات ،نوێژەکەی نیوەڕۆو عەسری لەگەڵ جەماعەت کردوە،بەم شێوەیە دورکاتی لە جیاتی نیوەڕۆیو دورکاتی لە جیاتی عەسر،بەلام دەڵێت کاتێك لە ئیشەکەی خۆم

بومەوە،چومە دەوری (حرم) نوێژەکەم بە (قصر و جمع)کردەوە،ئایا حوکمی ئەو نوێژەی کە لەگەڵ جەماعەتدا کردومە چیە بەم شێوەیە؟

کورتەی وەڵام : ئەو نوێژەی بەم شێوازە کردوتە دروست نیە ...،بەڵام باشتر وابو بۆت لە حاڵەتێکی ئاوادا کە نوێژت لەگەڵ جەماعەتدا بکردایە واتە نوێژی نیوەڕۆ پاشان بە تەنها نوێژی عەسرت بکردایە بە(قصر)..وبالله التوفيق ،سەیری (فتاوى اللجنةالدائمة) بکە130/8.

کەواتە ئەگەر فەرزو سوننەت بەدوای یەکەوە دروست بێت ئەولاترە کەوا کە دونوێژی فەرز بەدوای یەکەوە بکرێن لەگەل جیاوازی نیەتدا بەمەرجێك نوێژەکە لە نوێژی کەمتر نەبێ وەك کەسێك بیەوێ دورکات بەدوای ئیمامێکەوەبکات کە ئەو چوار رکات بکات .بۆ زیاتر تێگەیشتن سەیری خاڵی (10) بکەلەباسی کورت کردنەوەی نوێژدا....

## هەشتەم/ پێش خستنی نوێژی عەسر لە پێش نیوەڕۆدا یان عیشا لە پێش مەغریبدا :

پێشەکی پێویستە بزانین کەوا تەرتیبی نوێژەکان واجبە ،وە نابێت ئەگەر بەتەنها نوێژت کرد لە لەکۆکردنەوەدا یەکێکیان پێش بخەیت لەکاتەکەی خۆی وەك عیشا لە پێش مەغریبدا ،بەڵام ئەگەر هاتی بۆ مزگەوت ونوێژی نیوەڕۆت دوا خستبو بۆلای عەسر ،لەوکاتەشدا قامەت کرا بۆ عەسر چی دەکەی ؟هەندێك لەزانایان دەفەرمون نوێژی عەسر دەکەی وە پاشان نوێژی نیوەڕۆ دەکەی ،ئەوەی واشی کرد لەلای زانایان بەتایەتی پێشەوا أحمد دو بۆچون هەیە :بۆ چونی یەکەم ئەوەیە کە تەرتیبەکە تێك دەدەیت پاشان نوێژەکەی کە پێشت خستوە (واتە عەسرەکە یان عیشاکە)دەبێت دوبارە بکەیتەوە،وەڕاستیش وایە کە دوبارەی ناکەیتەوە،سەیری فەتوای (عثيمين) بکە. بەلام بۆ چونی دوەم ئەوەیە کە نیەتی نیوەڕۆ لە گەڵ عەسرەکەی ئەواندا دەهێنی ،چونکە رکاتەکانیان بەقەدەر

یەکن،کە ئەم نوێژەشت تەواو کرد،نوێژی عەسر بەتەنیا دەکەی،بەڵام ئەگەر هاتیتە مزگەوت و لەکاتی نوێژی مغربدا نوێژی عیشا کۆدەکرایە وەتۆش مغریبت نەکردبو،لەم حاڵەتەشدا چەند بۆ چونێکیان هەیە زانایان :شێخ ( محمد صالح العثیمین ) بۆ چونی وایە کە لەگەڵ عیشادا مغریب دەکەی ،بەڵام لە رکاتی سێهەمدا سەلام دەدەیتەوە،لە ڕاسیدا ئەم بۆ چونە ڕاست نیە،بەبەڵگەی فەرمودەی پێغەمبەر ﷺ کە دەفەرموێت (إنما جعل الإمام لاتم به،فلا تختلفوا عنه ) واتە :پێچەوانەی ئیمام مەکەن،مەبەست بەو پێچەوانە نەکردنە ، پێچەوانەکردنی ئیمامە لەکارەکاندا.( مجموعة الفتاوی )217/23.

هەروەها پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ : (أيها الناس اني امامكم فلا تسبقوني بالركوع ولا بالسجود ولا بالقيام ولا بالإنصراف)پێشەوا مسلم ریوایەتی کردوە.واتە : ئەی خەڵکینە من ئیمامی ئیوەم،نە بە رکوع و نەبە سجود و نەبە هەڵسان نەبە سەلام دانەوەش ،پێش من مەکەون پێشەوا ئەووی دەفەرموێ (والمراد بالإنصراف السلام ) سەیری شەرحی ( صحيح المسلم ) بکە599/2.فەرمودەی ژمارە( 426 ) هەروەها ( ابن ضويان ) دەفەرموێ :هەرکەسێك ڕکوعی برد یان سجود یان سەری بەرزکردەوە بە عەمدی پێش ئیمام پێویستە بگەڕێتەوە بۆشوێنی خۆی ،بۆ ئەوەی لەگەڵ ئیمامدا نوێژ بکات ،ئەگەر نەگەڕایەوە و لەسەری بەردەوام بو ئەوە نوێژەکەی بەتاڵ دەبێتەوە ،سەیری ( منار السبيل ) بکە 169/1.ئەمەش بۆ چونی جەماوەری زانایانە،هەروەها ئەم جۆرە نوێژە لای (مالك)یەکان و( حەنەفیە )کان وپێشەوا (أحمد ) بەتاڵە ،لە(مذهب)ی ( شافعی )نەبێت لەگەڵ وتەیەکی پێشەوا (أحمد ) واتە:لای جەماوەری زانایان بەتاڵە،سەیری ( مجموعة الفتاوی )بکە220/23.

کەواتە باشتر وایە نوێژی مغریب بەتەنها بکات:پاشان ئەوا چەند فریا بکەوێت نوێژەکەی عیشا تەواو بکات،چونکە دروستە لە کاتی نوێژی فەرز نوێژی فەرزی تربکرێت بە تەنها،وەك پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ: ( اذا أقيمت للصلاة فلا صلاة الا

المكتوبة ) رواه الجماعة الا البخاري. واته: ئەگەر قامەت کرا بۆ نوێژ نوێژ نیە مەگەر نوێژی فەرز نەبێت، کەواتە دروستە نوێژی فەرز بکرێت لەکاتێکدا کە نوێژی فەرزی تر دەکرێت،دوایش چەند فریا بکەویت نوێژەکە تەواو دەکەیت کەواتە تەرتیبی نوێژ تێك ناچێت وتێك نادرێت،چونکە (توقیف)یە واتە:بەبەڵگە نەبێت کەس بۆی نیە بە بۆچون پاش و پێشی بخات،بۆ باشتر شارەزابون لەمە سەیری (أضواء البیان)بکە 248/4،و(فتاوی اللجنة الدائمة)139-130/8 . و(المغنی مع شرح الکبیر)54-53/2بکە. پێغەمبەر دەفەرموێ ﷺ: ( اذا اقيمت للصلاة فعليكم بالسكينة ولا تسرعوا فما ادركتم فصلوا وما فاتكم فاتموا ) واتە: ئەگەر قامەت کرا بۆ نوێژ لە سەر خۆ بێن بۆ مزگەوت و پەلە مەکەن چەند فریاکەوتن بیکەن و چەندتان لە دەست چو بیکەنەوە ) کەواتە ئەگەر بۆ هاتنی مزگەوت کە سونەتێکە چەند ڕەکاتێکت لە دەست بڕوا دروست بێ ئەولاترە نوێژێکی فەرز لە کاتی خۆیدا بکەیت با جەماعەتیش بکرێت بۆ ئەوەی تەرتیبی نوێژەکان تێك نەدەیت کەواتە ئەگەر قامەت کرا بۆ عیشا تۆش مەغریبت نەکردبو نوێژی مەغریب بکە دوایی چەند فریا کەوتی تەواوی بکە . والله اعلم.

## نۆیەم/ نێوانی نوێژەکان لەکاتی کۆکردنەوەدا :.

ڕای (شافعیە)کان و(حنبەلیە)کان وایە کە واجبە نێوان نەبێت لە نێوانی ئەم دو نوێژەدا کە کۆدەکرێتەوە،بەڵام ڕاستر وایە کە لە نێوان نوێژەکاندا لەکاتی کۆکردنەوەدا دروستە نێوان هەبێت ،چونکە کۆکردنەوەی نوێژ بۆ لابردنی نارحەتیە،چۆن نەبێت بەشتێکی نارحەت نەبێت ،ئەوا کۆکردنەکە نەبێت ،ئەوە قورس کردنی دینە بۆیە (شیخ الإسلام)دەفەرموێت : (والصحيح أنه لا يشترط الموالاة بحال لا في وقت الأولى ولا في وقت الثانية فإنه ليس في ذلك حد في الشرع ،ولأن مراعاة ذلك يسقط مقصود الرخصة ) واتە: ڕاستر ئەوەیە کەوا مەرج نیە نێوان نوێژەکان هیچ شتێک نەبێ ،نەلەکاتی یەکەمدا وەنە لەکاتی دوەمدا،چونکە هیچ شتێك لەو بارەوە دیاری نەکراوە لە شەرعدا ،وە دیسان پاراستنی ئەم نێوانە -

بەوەی کە بەین وماوە نەبێت لەنێوان دو نوێژە کۆکراوەکەدا. مەبەستی ئاسان کاریەکە لەدەست دەدرێت، هەروەها دەفەرموێت: (ومعلوم أن مراعات هذه الأشياء من أصعب الأشياء علماً وعملاً ،وهو يشغل قلب المصلي عن مقصود الصلاة، الجمع شرع رخصة دفعاً للحرج عن الأمة ،فكيف لايشرع الا مع حرج شديد ومع ماينقض مقصود الصلاة) (مجموعة الفتاوى) 35/24. واتە: ئاشکرایە دەست گرتن بەوەوە واتە: کورتی نێوان نوێژەکان قورس ترین شتە و زانیاری پێی و ئیش کردن پێی

کۆکردنەوەش دانراوە بۆ ئاسان کاری و لابردنی ئارحەتی لەسەر ئوممەت ،جا چۆن دروست نیە تەنها لەگەڵ ناڕحەتی

زۆردا نەبێت، وەلەگەڵ دژی مەبەستی نوێژدا بەڵام پێویستە ئەوەی بزانین پێغەمبەر ﷺ سوننەتی لە نێوان دو نوێژ دا کە کۆی کردونەتەوە نەکردوە ، هەروەها وەکو باسمان کرد مەرج نیە دەبێ نیەتی کۆکردنەوە لەکاتی نوێژی یەکەمدا

نیەت بهێنی ئەوەیە ناگەیەنێ کە زیادە ڕەوی تیادا بکرێت واتە:لە کاتی کۆکردنەوەدا لە سنور دەرچین بەڵکو مەبەستمان ئەوەیە (موالاة) واجب نیە،تەنها لەبەر ئیشی پێویست نەبێت لە (عبدالله)ی عباسەوە کە دەفەرموێ (ان النبي ﷺ يصلي المغرب والعشاء بالمزدلفة جميعاً لكل واحدة منها بإقامة ولم يسبح بينهما ولا على اثر واحدة منهما)رواه البخاري. واتە: پێغەمبەر ﷺ نوێژی (مغرب و عیشا)ی کۆدەکردەوە لە موزدەلیفە وەبۆ هەر نوێژێکیان قامەت کرا سوننەتێکی لەنێوانیادا نەکردوبەدوای هیچیان سوننەتی نەکردوە وەهەروەها ئەم فەرمودە هەیە ،کە بەڵگەیە

لەسەر بونی نێوان و بەین لەنێوان ئەو دو نوێژە کە کۆدەکرێتەوە ،فەرمودەکەش ئەوەیە (ان النبي ﷺ لما جاء المزدلفة نزل فتوضأ فأسبغ الوضوء ثم أقيمت الصلاة فصلى المغرب ثم أناخ كل انسان بعيره في منزله ثم أقيمت العشاء فصلها ولم يصل بينهما شيئاً)کەواتە: دروستە چەند ئیشێك بکەیت لەنێوان هەردو نوێژدا هەروەها

عبد الله كوری مه‌سعود له نێوان نوێژی مه‌غریب و عیشادا نانی خواردوه ) سه‌یری ترتیبی مسندی امام احمد بكه 145/13 فتح الباری له‌گه‌ڵ صحیح المسلم له حاشیه‌كانیاندا هه‌روه‌ها سه‌یری مسائل فی الفقه‌المقارن بكه 179/1 به‌ڵام ته‌رك كردنی سوننه‌ت كۆڕای زانایانی له‌سه‌ره له موزده‌لیفه (نقل ابن المنذر الإجماع على ترك التطوع بين الصلاتين بالمزدلفة ) بڕوانه (نیل الأوطار)233/3،و(الثمرات الجیاد ) ص 164

## ده‌یه‌م/ ئایا دوای نوێژی ( جومعة )نوێژی عه‌سری له‌گه‌ڵدا كۆده‌كرێته‌وه؟

ابن باز هه‌روه‌ها شیخ (ابن عثیمین ) ره‌حمه‌تی خوایان لێبێ بۆچونیان وایه كه له‌دوای نوێژی ( جمعه )ه‌وه ناتوانیت نوێژی عه‌سری له‌گه‌ڵدا كۆبكه‌یته‌وه چونكه نوێژی ( جمعة ) نوێژێكی سه‌ربه‌خۆیه به‌ڵام: (أصل ) تیایدا وایه‌كه كۆكردنه‌وه‌ی نوێژی جمعه دروسته له‌گه‌ڵ نوێژی عه‌سردائه‌گه‌ر عوزرێك هاته پێشه‌وه له‌به‌ر پاراستنی نوێژی عه‌سر چونكه خوای گه‌وره ئه‌فه‌رموێ (حافظوا على الصلوات والصلاة الوصطى ) زانایانی تفسیر ئه‌فه‌رمون( صلاة الوسطى ) نوێژی عه‌سره هه‌روه‌ها ئه‌و فه‌رموده‌یه‌ی پێغه‌مبه‌ر ﷺ : (اذا حضر أحدكم الأمر الذي يخشى فوته فليصل هذا الصلاة ) (صحیح الجامع )ص487.النسائی287/1.

واته: ئه‌گه‌ر یه‌كێكتان ئیشێكی هاته پێشه‌وه ترساله‌وه‌ی كه‌وا نوێژه‌كه‌ی ده‌فه‌وتێ ئه‌وا با ئه‌و نوێژه‌بكات ـ واته كۆكرنه‌وه‌ی نوێژ. ئه‌م ده‌قه‌ش گشتی و ( عامة ) وه‌كو خۆی ده‌مێنێته‌وه مه‌گه‌ر به‌ڵگه‌یه‌ك هه‌بێت تایبه‌تی بكات به ( جمعة ) وه پاشان كه پێغه‌مبه‌ر ﷺ نه‌یكردوه به‌ڵگه نیه چونكه وه‌ك زانایانی ( أصول )ده‌فه‌رموێ: (السكوت في معرض البيان بيان )واته:بێ ده‌نگی له كاتی رون كردنه‌وه‌دا ،رون كردنه‌وه‌یه،كه‌واته ئه‌گه‌ر پێغه‌مبه‌ر ﷺ نه‌هی لێ بكردا ئه‌وه نه‌هی لێ ده‌كرد.وه‌هه‌روه‌ها له‌به‌ر ئه‌وه‌ی كه ئاسان كاری پێویسته

بەهەمونوێژەکانەوە بۆ نمونە پێغەمبەر ﷺ بۆ نوێژی شەو و نوێژی ڕۆژ لەبارانانداا جیاوازی نەکردوە، بۆیە ( عبدالله )ی کوڕی

عومەر فەرمانی بەبانگدەرەکە کرد کەوا لەماڵەوە نوێژ بکەن،(ان ابن عمر اذن بالصلاة في ليلة ذات برد وريح فقال الاصلوا في رحالكم ،ثم قال كان رسول الله ﷺ يأمر بالمؤذن اذا كانت ليلة باردة ذات مطر يقول الا صلوا في رحالكم) واتە :عبدالله ی کوڕی عمر بانگی دا بەنوێژکردن لە شەوێکی سەرماو بادا وفەرموی :لەماڵەوە نوێژ بکەن ، پاشان فەرموی: پێغەمبەر ﷺ فەرمانی دەکرد بەبانگ دەر لە شەوێکی سارد و باراناویدا دەیفەرمو:لەماڵەوە نوێژ بکەن ، پێشەوا مسلم ریوایەتی کردوە799/2.فەرمودەی ژمارە ( 679 ).

بەهەمان شێوە لەڕۆژی ( جمعة ) دا پێغەمبەر ﷺ فەرمانی کردوە کە شوێنەکانی خۆتان نوێژ بکەن ( عن عبد الله بن عباس ): ( أنه قال لمؤذن في يوم مطير إذا قلت : أشهد أن لا اله الا الله ،أشهد أن محمداً رسول الله ،فلا تقل حي على الصلاة قل :صلوا في بيوتكم ،قال: فكان الناس إستنكروا ذلك فقال أتعجبون من ذا ؟ قد فعل من هو خير مني إن الجمعة عزمة واني كرهت أن أخرجكم فتمشوا في الطين والدحض ) واته : عبد الله کوڕی عباس لە ڕۆژێکی باراناویدا فەرموی بەبانگدەرێك ئەگەر وتت (أشهد أن لا اله الا الله أشهد أن محمداً رسول الله ) مەڵێ ( حي على الصلاة ) بەڵکو بڵێ ( صلوا في بيوتكم ) واتە : لەماڵەکانتان نوێژ بکەن ،وەك بڵێت خەڵکی بەلایانەوە سەیر بو ،وە بەباشیان نەزانی (عبد الله ) ی کوڕی عەباسیش فەرموی : (ئێوە بەلاتانەوە سەیرە ئەمەی کە من کردم بەلام یەکێك وای کرد کە لەمن باشترە ،نوێژی ( جمعة ) حەتمەن واجبە بەلام پێم ناخۆش بو لە قوڕو چلپاودا بێن بۆ نوێژ ( مسلم )ریوایەتی کردوە،(شرح صحيح مسلم)ج800/2 فتح الباری ج42/3.جا ئەگەر پێغەمبەر ﷺ جیاوازی شەو ڕۆژی نەخستبێ - لە ئەحکامدا- جا چ ( جمعة )بێ یان نوێژی تر ئەوا ئەولا ترە کە نوێژی عەسر کۆبکرێتەوە بەلام سەبارەت بەدواخستنی ( جمعة ) بۆلای عەسر لەکاتی

نیشتەجێبیدا بەبێ (عذر) تەرك ناكرێت لەبەر گەورەیی نوێژی جمعە مەگەر عوزرێکی هەبێت ئەوا لەگەڵ عەسردا نوێژی نیوەڕۆ دەکات نەك جومعە وەك عبد الله ی کوڕی مسعود دەفەرموێت: (من فاتته الركعتان فاليصل أربعاً ) رواه إبن أبي شيبة والطبراني نقلاً عن القول المبين 320.بەم شێوەیە بۆمان ڕون بویەوە کە دروستە کۆکردنەوەی نوێژی عەسر لەگەڵ جومعەدا .

## یانزەهەم/نوێژی جومعة لەسەر (مسافر) :

هەندێ لە زانایان بۆچونیان وایە کە نوێژی جومعە تەنانەت لە سەر موسافریش واجبە ئەوەش بۆچونی (ظاهریەکان)ە چونکە لای (ظاهریەکان) نیشتە جێ بون مەرج نی‌یە بۆ جومعە بەلاَم جەماوەری زانایان و هەرچوار پێشەواکە لەسەر ئەوەن کە جمعە واجب نی‌یە لەسەر موسافر ئەمەش ئەوە ئەگەیەنێ کە لای جەماوەری زانایان نیشتەجێبون مەرجە بۆ جومعە )مسائل فى الفقه المقارن 110/1

ئەم بابەتەش پێویستی بەڕون کردنەوە هەیە ئەویش بەم شێوەیە :.

ئەگەر سەرەتای ڕۆژی جومعە بودروستە (مسافر)سەفەرەکەی بکات ،بەلاَم پیش بانگدان واتە : (زوال)پێشەوا شافعی

دو وتەی لەسەر هەیە ،وتە کۆنەکەی دەڵێت: (دروستە،بەلاَم وتە تازەکەی دەڵێت :دروست نیە وەك دوای بانگ دان وایە

بەلاَم لای پێشەوا مالیك ((أبوالقاسسم)) ئەفەرموێ : ((ولا يسافر أحد يوم الجمعة بعد الزوال حتى يصلى ولا بأس أن يسافر قبل الزوال والإختيار أن لا يسافر إذا طلع الفجر وهو ماض حتى يصلى الجمعة ) واتە: کەس سەفەر ناکات ڕۆژی جومعە دوای بانگدان تاوەکو نوێژی جومعە ئەکات ،وە قەیدی ناکات ئەگەر پێش بانگدان سەفەر بکات هەڵبژاردەش ئەوەیە کەوا کەس سەفەر ئەکات لە دوای بانگی بەیانیە وە کە ئامادە بێت هەتاوەکو نوێژی جومعە ئەکات .سەیری(زاد المعاد)بکە 371/1.

بێگومان ئەگەر ئیشێکی پێویستی هەبو ئەوا دروستە سەفەر بکات هەروەك (عبد الرزاق)لە (مصنف)ەکەیدا ڕیوایەتی کردوە لە ((ثوري)ەوە ئەویش لە (أسودی کوری قیس) ەوە ئەویش لە باوکیەوە ئەفەرموێت (أبصر عمر ابن الخطاب رجلاً عليه هيئة السفر وقال الرجل :إن اليوم يوم جمعة ولولا ذلك لخرجت ،فقال عمر إن الجمعة لا تحبس مسافراً فاخرج مالم يحن الرواح) (1)بڕوانە (مصنف)ی (عبد الرزاق)5536 (زاد المعاد372/1، (تحفة الأحوذي)54/3، (فتاوى اللجنة الدائمة) 204/8-208باشتریش وایە ڕۆژی پێنج شەممە سەفەر بکات چونکە (کعب بن مالك) دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەر ﷺ: (کان يحب أن يخرج يوم الخميس )بخاری 113/6 ،بەڵام ئەگەر زۆر پێویستی بەدەرچون ئەبو پێشین بەباشیان ئەزانیوە سەفەر بکات وەك (معمر)دەفەرموێت: (پرسیارم کرد لە یحیى ی کوری کثیر ئایادروستە کەسێك لە ڕۆژی جومعەدا سەفەر بکات ؟ئەویش لە وەڵامدا پێی باش ئەبو منیش هەر زیاتر قسەم دەکرد لە گەلیدا لەو بارەیەوە بۆ ئەوەی کە ڕێم پێبدات ئەویش فەرموی : کەم جار دەبێت کەسێك لە ڕۆژی جومعەدا سەفەر بکات ئیللا توشی شتێك ئەبێت کە پێی ناخۆشە لە سەفەرەکەیدا وە ئەگەر دەتەوێت ڕاستی قسەکەی منت بۆ دەر کەوێ ئەوا دەتوانیت تاقی بکەیتەوە. بڕوانە (مصنف)ی (عبد الرزاق)5541وە (زاد المعاد) 373/1،هەروەها پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت: (الجمعة على من سمع النداء ) رواه أبوداود وغيره بڕوانە (إرواء الغليل 58/3)،

## دوانزەهەم/ئەگەر کەسێك نوێژەکانی بە( جمع )ی تقديم کرد بۆ کاتی نوێژی دوەم گەڕایەوە شوێنی خۆی:

لەم بارەیەوە پێشەوا (ابن قدامة) لە(المغنى)دا دەفەرموێت: ( .. وان اتم الصلاتين في وقت الاولى ثم زال العذر بعد فراغه منهما قبل دخول وقت الثانية أجزاته ولم تلزمه الثانية في وقتها، لأن الصلاة وقعت صحيحة مجزية عن ما في

ذمته وبرأت ذمته منها، فلم تشتغل الذمة بها بعد ذلك، ولأنه أدى فرضه حال العذر فلم يبطل بزواله بعد ذلك كالمتيمم إذا أوجد الماء بعد فراغه من الصلاة ..) (المغنى مع الشرح الكبير) 125/2 .

واته: ئەگەر بێت وکەسێك دو نوێژی کۆکردەوە بە پێش خستن (التقديم) واتە: کردنی هەردو نوێژەکە لەکاتی یەکەمیاندا، پاشان ئەو عوزرەی کەئەم کەسە لەبەری نوێژەکانی بۆ کۆکردۆتەوە نەما دوای ئەوەی کەئەم لەهەردو نوێژەکەی بوەتەوە وەپێش، ئەوەی کەکاتی نوێژی دوەم بێت، ئەو کۆکردنەوەیە دروستە، وەپێویست ناکات نوێژەکەی دوەم لەکاتەکەی خۆیدا بکاتەوە، چونکە ئەم کەسە نوێژەکەی کەکۆکردۆتەوە لەکاتی کۆکردنەوەکەیدا بۆی دروست بوە بیکات وکۆییکاتەوەو لەگەردنیدا نەماوە، جالەبەر ئەوە نوێژەکەی دوەمی کەکردویەتی بەکۆکردنەوە دا بەزراوەو دروستە، وەدوای ئەوەش کەلەنوێژی دوەم بوەتەوەو پاشان عوزرەکە نەماو، ئەوانە مانی عوزرەکە دوای لێ بونەوەکەی نابێتە هۆیەك بۆ ئەوەی کە نوێژەکەی دوەم هەر لەگەردنیدا بمێنێتەوەو لانەچێت، بۆنمونە: کەسێك کەنوێژەکەی بە تەیەموم دەکات لەبەر نەبونی ئاو، دوای ئەوەی کەلە نوێژەکەی دەبێتەوەو ئاو دەدۆزێتەوە، ئەو ئاو دۆزینەوەیە نابێتە هۆی بەتاڵ بونەوەی ئەو نوێژەی کەکردویەتی ..).

هەر لەم بارەوە فەتوایەکی لیژنەی فەتوای سعودی هەیە کەدەڵێت: ئەگەر بێت و(مسافر) نوێژەکانی نیوەڕۆو عەسری کۆکردەوە، هەروەها مەغرب وعیشا، بە پێش خستن (لتقديم) وە پاشان ئەو (مسافر)ە دەگاتە شوێنی خۆی پێش ئەوە کە کاتی نوێژەکەی دوەم بێت، یان دوای ئەوەی کەکاتی نوێژ دوەم هاتوە جا عیشا بێت یان عەسر، ئەوا ئەو نوێژەی کەئەم (مسافر)ە کردویەتی - واتە کۆکردنەوەی نیوەڕۆو عەسر ومەغرب عیشا بە(التقديم) - دروست وتەواوە، لەبەر ئەوەی کەکاتێك کۆی کردۆتەوە بەعوزرێکی شەرعی کۆی کردۆتەوە کە ئەویش سەفەرە ..) وبالله التوفيق (فتاوى اللجنة الدائمة) 137/8 .

**تێبینی/ ئەگەر کەسێك ترسی دەسەڵاتدارێکی ستەمکاری هەبو بۆی هەیە** ( جمعه ) **نەکات، ئەو ستەمکارەش موسڵمان بێت یان کافر، ئەم حوکمە تیایدا** یەکسانە ( **شیخ الاسلام** ) **دەفەرموێت:** ( **وتسقط الجمعة عمن يخاف بحضوره فتنة إذا** لم يكن ظالما ) ( **الفتاوى المصرية** ) **ص** 79

واتە: ( **جمعة** ) **لادەچێت لەسەر کەسێك بزانێت ئەگەر بڕوات تووشی فیتنە دەبێت** بەو مەرجەی **خۆی ستەم کار نەبێت .**

**وصلى الله على نبينا محمد وعلى آله وصحبه وسلم.**

## پێرستی بابەتەکان